







# ڕێبەر

گۆڤارێکی وەرزی پێشمەرگانەی هەمەڕەنگە
مەڵبەندی ڕێکخستنی پێشمەرگە دەریدەکات



## کۆڕەوەکەی ساڵی ١٩٩١




گۆڤارێکی وەرزی پێشمەرگانەی هەمەڕەنگە
مەڵبەندی ڕێکخستنی پێشمەرگە دەریدەکات

Email: govaryrebar@gmail.com

خاوەنی ئیمتیاز:مەڵبەندی ڕێکخستنی پێشمەرگە

سەرنووسەر: بەرزان حاجی ئیبراهیم چەرمەگا
٠٧٧٠١٥٣٣٥٣٢

بەڕێوبەری نووسین: ئیسماعیل خالید
٠٧٧١٩٦٨٥٩٣٨

دیزاین و کاری هونەری: سەرمەند سەلیم

# پێڕست

# ڕاپەڕین وەرچەرخانێکی مێژوویی

سەرنووسەر

ئـەو دەمــەی دڕندەیــی ڕژێمــی بەعــس هەمــوو گونــد و کانیاوەکانــی ژێرەوژوورکردبــوو، کوردســتان وێران و چــۆڵ بــوو، بایەقــوش تێیــدا دەخوێنــد، خاکــە بەجێماوەکەشــی کردبــووە ناوچــەی قەدەغەکــراو.

چارەنووســی میللەتەکەمــان لــەو دەمــەدا بــەرەو نەهامەتــی و لەناوچــوون دەڕۆیشــت، توڕەیــی خەڵــک لەنێــو شــار و شــارۆچکەکاندا پەنگــی خواردبــۆوە و قوڵپــی دەدا و بــۆ دەرفەتێــک دەگــەڕان، تاوەکــو مافــی ڕەوای خۆیــان بەدەســتبهێنن. ئــەو هەلومەرجــەی لــەو دەمــەدا لــە عێراقــدا بەرجەســتەبوو، زەمینەســازییەکی وەهــای ڕەخســاند ڕاپەڕیــن بکرێت، ســەرمەشــقی ئــەو ڕاپەڕینــەش یەکێتیــی نیشــتمانیی کوردســتان بــوو کــە نەخشــەی ســەرتاســەری بــۆ دانــا.

لــە ڕاپەڕینــدا توانــرا، ســەرپاکی خاکــی کوردســتان ڕزگاربکرێــت، بــە کەرکوکــی قودســی کوردستانیشــەوە کــە کەوتــەوە ژێــر دەســەڵاتی خاوەنــە ڕاســتەقینەکەی، بــەڵام بەداخــەوە لــەو دەمــەدا پشــتیوانییەکی نێودەوڵەتــی وەهــا لــە مافــە ڕەواکانــی گەلــی کــورد نەکــرا، بگــرە گڵۆپــی ســەوزیشــیان بــۆ ڕژێــم هەڵکــرد، تــا پەلامــاری گەلــی کــورد بداتــەوە.

ئــەو پەلامــارە بــووە هــۆی دروســتبوونی کــۆڕەوە مەزنەکــەی گەلــی کــورد، ئــەو کــۆڕەوە ملیۆنییــەش وایکــرد، وڵاتانــی جیهــان بێنــە ســەر خــەت و بەرگــری لــە خەڵکــی ســڤیل بکــەن.

پشــتیوانی نێودەوڵەتــی لــە گەلــی کــورد لــە دوای کۆڕەوەکــە، وایکــرد دەرفەتێکــی بــاش بــۆ کــورد بڕەخســێت کــە دواتــر پرۆســەی دیموکراتــی و پێکهێنانــی حکومەتــی هەرێمــی کوردســتانی لێکەوتــەوە، ئەمــەش کەشــێکی ئــازادی و دیموکراتــی وەهــای ڕەخســاند کــە تائێســتاش لــە عێــراق بــە تایبەتــی و لــە ناوچەکــە بــە گشــتی، وێــڕای کەموکوڕییــەکان، وەک نمونەیــەک تەماشــا دەکرێــت.

ئــەم دەســتکەوتانەش بەرهەمــی خوێنــی شــەهیدانە و پشــکی شــێری ئــەو ســەروەرییەش بــەر یەکێتــی نیشــتمانیی کوردســتان دەکــەوێت کــە بــە شــانازییەوە خاوەنــی ڕاســتەقینەی ڕاپەڕیــن و ئــەم ئەزموونــەی ئێســتایە.



پرۆفیسۆر/دکتۆر حەزا تۆفیق تالیب
پسپۆڕی جیۆستراتیج و ئاسایشی نەتەوەیی

# کاریگەری ڕووبەر و شێوەی دەوڵەت لەسەر ستراتیژی سەربازی

لە لێکۆڵینەوەکانی جیۆستراتیژ و جوگرافیای سەربازیدا بەبەردەوامی سەرکردە سەربازی و ستراتیژییەکان جەخت لەسەر شوێنی پرۆسە سەربازییەکان (شوێن) دەکەنەوە، تا بەشێوەیەکی ورد سەرجەم ڕەهەندەکانی لە ڕوانگەی سەربازییەوە لێکبدەنەوە، بەو پێیەی مەیدانی ڕاستەقینەی ڕووبەڕووبوونەوە بریتییە لە گۆڕەپانی جەنگ. لێرەدا پسپۆڕانی بواری سەربازی و جوگرافیای سەربازی تایبەتمەندییەکانی گۆڕەپانی جەنگ لەڕووی تۆبۆگرافیا و ئاو و هەوا و دارستان و شێوە و ڕووبەرەوە، وەک فاکتەرێکی سەرەکی و یاریدەدەر بۆ بەدەستهێنانی سەرکەوتن ئەژماردەکەن و لەژێر ڕۆشنایی ئەم فاکتەرانەدا پلان و تاکتیکی جەنگ دادەڕێژن. ئێمە لێرەدا باس لە کاریگەری ڕووبەر و شێوەی دەوڵەتی

ئیسرائیل دەکەین لەسەر ڕەوشی سەربازی و سیاسی ئەو وڵاتە. بەو پێیەی لە ساڵی ١٩٤٨وە کە دەوڵەتی ئیسرائیل دامەزراوە ئەم دوو فاکتەرە جوگرافییە (ڕووبەر) و (شێوە). کاریگەری لەسەرجەم پلانی جیۆستراتیژ و ئاسایشی نەتەوەیی ئیسرائیلدا بەجێهێشتووە.

## ڕووبەری ئیسرائیل:

لە زمانی جوگرافیای سیاسیدا ڕووبەر ڕۆڵێکی سەرەکی دەبینێت بەو پێیەی لە کۆتاییدا ئەو نیشتمانەی لێپێکدێت کە ئارامی و ژیانێکی هەتاهەتایی بۆ دانیشتوانەکەی فەراهەم دەکات. لەم بارەیەوە جوگرافیاناسی سیاسی (ڕاتزل) دەڵێت:»شتێکی بەڵگەنەویستە هەموو دەوڵەتان لە کێشمەکێشێکی بەردەوامدان لەگەڵ جیهانی دەرەوەیان (مەبەستی دەوڵەتانی دراوسێیە) لەپێناو بەرگریکردن لەو ڕووبەرەی کە بەدەستی هێناوە (١). و هەر دەوڵەتێکی بەهێز و ڕێکخراو لە هەوڵی زیادکردن و بەرفراوانکردنی ڕووبەرەکەیدایە. لەبەر ئەوەی ئەم بەرفراوانییە دەرامەتی سروشتی و تا ئاسایشی زیاتری بۆ زامن دەکات (٢). کۆی ڕووبەری ئیسرائیل خۆی دەدات لە (٢٧،٠٠٩ کم٢) لەو ڕووبەرە نزیکەی (٣٦٤ کم٢) بریتییە لە کەرتی غەزە و (٥،٦٥٠ کم٢) (٣) یشی بریتییە لە خاکی کەناری ڕۆژئاوا کە بە خاکی ژێردەسەڵاتی فەلەستینییەکان دەناسرێن و کۆی ڕووبەریان دەگاتە (٦،٠١٤ کم٢) و لە (٢٢،٢٪) کۆی ڕووبەری ئیسرائیل پێکدەهێنێت. واتە ئیسرائیل لە (٧٧،٨٪) کۆی ڕووبەری لەژێر ڕکێفدایە. کە دەکاتە (٢٠،٩٩٥ کم٢). بڕوانە نەخشەی ژمارە (١). بەگوێرەی پۆلێنکردنی ڕووبەری وڵات جوگرافیای سیاسیدا ئیسرائیل لە پۆلێنی وڵاتە خاوەن ڕووبەرە زۆر بچوکەکان پۆلێن دەکرێت. بەم پێیەش بە بەردەوامی هەڕەشەی ئەوەی لەسەر دەبێت کە لەلایەن دوژمن و نەیارانیەوە هێرشبکرێتەسەری و بە ئاسانی وڵاتەکەیان داگیربکرێت.

بەو پێیەی ئیسرائیل هاوسنوری چوار وڵاتی عەرەبییە کە ئەوانیش بریتین لە «سوریا و لوبنان و میسر و ئوردن» و بە هەر چوار وڵات نزیکەی (٨٢٥ کم)٤. درێژی سنووریان لەگەڵ ئیسرائیلدا هەیە، ئەم دۆخە جیۆستراتیژییە بە بەردەوامی جۆرە هەڕەشە و مەترسییەکی بەردەوامی بۆ ئیسرائیل هێناوەتە ئاراوە. بە تایبەتیش لە کاتی هێرشی سەربازی بەکۆمەڵی ئەو چوار وڵاتە بۆ سەر ئیسرائیل و خەسڵەتی بچووکی و ڕووبەرَی ئیسرائیلیش دەکەوێتە ژێر کاریگەری وڵاتانی دراوسێوە. وەک چۆن پێشتر لە حوزەیرانی ساڵی ١٩٦٧دا پێنج وڵاتی عەرەبی کە چواریان هاوسنووری ئیسائیل بوون (سورياو لوبنان و میسر و ئوردن) و عیراقیش چووە پاڵیان بۆ هێرشکردنە سەر ئیسرائیل و لە ماوەی نێوان ٥-١٠ حوزەیرانی ١٩٦٧دا لە هێرشێکی شەش ڕۆژیدا، ئەو پێنج وڵاتە بە گەلەکۆمەک و لە چەند قۆڵێکەوە هێرشێکی بەر بڵاویان کردە سەر ئیسرائیل، بەڵام لەو شەش ڕۆژەدا ئیسرائیل توانی نەک هەر تێکیان بشکێنێت، بەڵکو چەند ناوچەیەکی بەربڵاوی لە میسر و ئوردن و سوریاش داگیرکرد، وەک (نیمچە دۆرگەی سینا لە میسر، کە پاشان دوای ڕێککەوتننامەی ئاشتی گەڕایەوە بۆ میسر، جۆلان لە سوریا کە تائێستاش بە دەست ئیسرائیلەوەیە، هەروەها کەناری ڕۆئاوای لە ئوردن و کەرتی غەزەشی لە میسر داگیرکرد) لێرەدا ئەوەی لە ڕوانگەی جوگرافیای سەربازییەوە لێکدەدرێتەوە بچووکی ڕووبەری ئیسرائیلە لە کاتی هێرشی بەکۆمەڵی وڵاتانی عەرەبی هاوسنووردا، بۆ چارەسەرکردنی ئەم مەترسییە سەربازییە ئیسرائیل دوو چارەسەری سەرەکی گرتەبەر بۆ دورخستنەوەی مەترسییە سەربازییەکان لەسەری، ئەوانیش بریتیبوون لە:

**یەکەم:** بەستنی پەیماننامەی ئاشتی لەگەڵ هەریەک لە میسر و ئوردندا، کە درێژترین سنووریان لەگەڵ ئیسرائیلدا هەیە، بۆنمونە سنووری نێوان میسر و ئیسرائیل (٣١٠ کم) دەبێت و لەگەڵ ئوردنیشدا (٣٦٠ کم) دەبێت، بەمەش ئیسرائیل توانیویەتی لەڕێگەی کەناڵی سیاسی و دیپلۆماسییەوە تارمایی هێرش و جەنگ لەخۆی دوربخاتەوە و ئاسایشی سەربازی ئیسرائیل لەو دوو بەرەوەیەوە بپارێزێت.

**دووەم:** خۆپڕچەککردن و بەدەستهێنانی تەکنەلۆژیای سەربازی پێشکەوتوو، وەک چەکی ئەتۆم. وەک سەرچاوەکان ئاماژەی پێدەکەن ئێستا ئیسرائیل خاوەنی نزیکەی «۲۰۰ کلاوەی ئەتۆمییە» لە جۆری ۲۰ کیلۆ تۆن و توانیویەتیشی پەرە بە مووشەکی بالیستی دوورمەودا بدات بە ناوی (ئەریحا -۲). کە توانای هەڵگرتنی کلاوەی ئەتۆمی هەیە (٥). هەروەها ئیسرائیل توانایەکی بێ وێنەی سەربازی و پلاندانانی هەیە بۆ ئامادەکردن و کۆکردنەوەی هێزی سەربازی یەدەگ لە ماوەی ٢٤ کاتژمێردا بۆ بەربەرچدانەوەی هەر هێرش و مەترسییەک (٦).

## شێوەی ئیسرائیل:

شێوەی دەوڵەت کاریگەری ڕاستەوخۆ لەسەر پرۆسەی سەربازی بەجێدەهێڵێت. بەو پێیەی جۆری شێوەی بەرفراوان زیاتر دەتوانێت ببێتە هۆکارێکی یارمەتیدەری ستراتیژی بۆ دەوڵەت لە کاتی جوڵەی سەربازی و دابەشکردنی یەکە سەربازییەکان و دامو دەزگا ستراتیژییەکانی وەک سەربازگە و فڕۆکەخانە و بەنداو و کارخانە گەورەکان. بەڵام ئەوەی لە شێوەی نەخشەی وڵاتی ئیسرائیلدا دەبینرێت بریتییە لەوەی کە ئیسرائیل شێوەی درێژی هەیە. بڕوانە نەخشەی ژمارە (۲). درێژی ئیسرائیل لە باکوورەوە بۆ باشوور (٤٣٠ کم). لە کاتێکدا پانتاییەکەی لە بەشی باکوورییەوە لەنێوان (٥١- ٧٠ کم) و لە ناوەڕاستی وڵاتدا پانتاییەکەی دەگاتە نێوان (٧٢- ٩٥ کم) و لە بەشی باشووری ئیسرائیلدا دگاتە (١١٧ کم) و لەوپەڕی باشووری ئیسرائیل پانتایی خاک کەمدەبێتەوە بۆ کەمترین قولایی و دەگاتە (١١ کم) لەنێوان شاری عەقەبەی ئوردنی و مەرشەڕشی میسریدا. لێرەدا هەژاری ئیسرائیل بەدەردەکەوێت لە بواری «قولایی ستراتیژیدا» بەو پێیەی کە خاوەنی ڕووبەرێکی بچووکی شێوە درێژکۆلەیە و کەمترین بواری جوڵەی سەربازی و ستراتیژی دەبێت و بە ئاسانی ناتوانێت جوڵە بە هێزەکانی بکات لەو ڕووبەر و شێوە نەگونجاوەدا و بە ئاسانی ناتوانێت دامو دەزگا ستراتیژی و ئابووری و تەکنەلۆژیاکانی بەشێوەیەکی گونجاو بلاوبکاتەوە. بەو پێیەی جگە لە ڕۆژئاوای ئیسرائیل کە دەریای سپییە. لە باکوور و ڕۆژهەلات و

## نەخشەی ژمارە (٢)
## شێوەی دەوڵەتی ئیسرائیل



ڕۆژئـاواوە بـە وڵاتـی عـەرەبـی گـەمـارۆدراوە و ناتوانێـت بەئاسـانی مانـۆڕ و جوڵـە ستراتیژییەکان لەو سنوورە نزیکانەوە بەئەنجام بگەیەنێت.

ڕووبەری ئیسرائیل کە (٢٧،٠٠٩ کم٢) بەراورد بە ڕووبەری ئەو جۆرە وڵاتە عەرەبییەی کە هاوسنوورن لەگەڵیدا کۆی ڕووبەریان دەگاتە (١،٢٨٦،٩٧٤ کم٢) . واتە ڕووبەری ئیسرائیل تەنیا ٢٪ی کۆی ڕووبەری ئەو چوار وڵاتە پێکدەهێنێت. ئەم دۆخە جیۆستراتیژییەی کە بۆ ئیسرائیل هاتۆوتە کایەوە لە ڕووبەری بچووک و شێوەی درێژکۆلە، بە ئاسانی ناتوانرێت جەنگی ڕووبەڕووبوونەوەی تێدا ئەنجام بدرێت و ئیسرائیل ناچار بووە کە ستراتیژی ئاسایشی نەتەوەیی خۆی، بەتایبەتیش پلانی جەنگ و شێوازی ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ وڵاتانی عەرەبی هاوسنووردا بەشێوەیەک دابڕێژێت کە بگونجێت لەگەڵ ڕووبەر و شێوەی درێژکۆلەی ئیسرائیلدا و بۆ ئەم مەبەستەش چەند بنەمایەکی جیۆستراتیژی کردۆتە ئامانج بۆ ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ دراوسێکانیدا، لەو بنەمایانەش:

یەکەم: بە حوکمی ڕووبەری بچووک و شێوەی درێژکۆلەی ئیسرائیل، ستراتیژی ئاسایشی سەربازی ئیسرائیل هەر لە سەرەتای ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ وڵاتانی عەرەبیدا پلانی گواستنەوەی جەنگی بۆ وڵاتانی دراوسێی دا، واتە ئەگەر هەر جۆرە جەنگێک لەنێوان ئیسرائیل و وڵاتانی عەرەبی دراوسێیدا ڕوویدا، ئەوا با جەنگەکە لە دەرەوەی سنووری ئیسرائیل ئەنجامبدرێت، لەبەر ئەوەی ڕووبەر و شێوەی ئیسرائیل بەرگەی ئەنجامدانی پرۆسە سەربازییەکان ناگرێت، لەبەر ئەوە هەر لە سەرەتای ڕووبەڕووبوونەوە سەربازییەکانەوە سوپای ئیسرائیل بەگوێرەی پلانی گواستنەوەی جەنگ بۆ دەرەوەی ئیسرائیل، بەرزاییەکانی جۆلانی لە سوریا داگیرکرد، هەروەها کەناری ڕۆژئاوا لە ئوردن و نیمچە دۆرگەی سینا لە مسیر، بە مەبەستی ئەنجامدانی جەنگ لە خاکی دوژمندا و کەمکردنەوەی زیانەکان لە خودی ئیسرائیل.

دووەم: گرنگیدانی تایبەت بە هێزی ئاسمانی و مووشەکی لەنێو سوپای ئیسرائیلدا، تاوەکو دور بە دور بتوانێت هێز و توانای بەرامبەر تێکبشکێنێت و لاوازی بکات، بۆ ئەم مەبەستە لە ئەیلولی ١٩٨١دا ئیسرائیل و ئەمریکا ڕێککەوتننامەی هاریکاری ستراتیژیان

مۆرکـــرد بـــە مەبەســـتی بونیاتنانـــی جبەخانـــە و هاوردەکردنـــی چـــەک و تەقەمەنـــی و پاڵپشـــتیکردنی ســـەربازی و ســـتراتیژی ئیســـرائیل لـــە ســـەرجەم بـــوارە ســـەربازییەکاندا.

ســێیەم: وەک پێشــتر ئاماژەمــان پێکــرد ئیســرائیل خاوەنــی عەمبارێکــی گــەورە و بەهێــزی چەکــی ئەتــۆم و مووشــەکی بالیســتییە و دەتوانێــت لــە کاتــی پێویســتدا بەکاریانبهێنێــت.

چــوارەم: گرتنەبــەری پرۆســە ســەربازی و هەواڵگرییــە پیشــوەختەکان «الاســتباقیە». واتــە پێش ئــەوەی جەنــگ و هێــرش و مەترســی بێنەئــاراوە ســوپای ئیســرائیل گــورزی خــۆی لەنێــو جەرگــەی وڵاتانــی نەیاردا دەوەشــێنێت لــە نمونــەی لێــدان و بۆردومانکردنــی کــورەی ئەتۆمــی عێــراق لــە ســەرەتای هەشــتاکانی ســەدەی رابــردوودا و لێدانــی بــارەگای رێکخــراوی رزگاریخــوازی فەلەســتینی لــە تونــس و لێدانــی کاروانێکــی گــەورەی چــەک و تەقەمەنــی لــە ســودان کــە وابڕیــار بــوو بنێردرێــت بــۆ جوڵانــەوەی «حەمــاس».

بەمپێیــە ئامانجــی ســتراتیژی ئیســرائیل بریتیــە لــە پاراســتنی رووبــەری بچووکــی ئیســرائیل. هــەروەک (مۆشــی دایــان) دەڵێــت ئــەوەی بڕیــار لــە سیاســەتمان دەدات ئاسایشــە (٧).

## سەرچاوەکان


١-پ.د. جەزا تۆفیق تاڵیب. جوگرافیای سەربازی. سلێمانی. ٢٠٢٠. ل ١٨٧-١٨٨.

٢-د.صلاح الدين الشامي. دراسات في الجغرافية السياسية. مطبعة الانتصار. ط ٢. ١٩٩٩. الاسكندرية. ص ٥٥.

٣-حسن عبدالقادر صالح. فلسطين المحتلة ١٩٦٧ جغرافيا و ديموغرافيا. مجلة شؤون عربية. العدد (٦٠). ١٩٨٩. ص ٧.

٤-كمال موريس. الموسوعة الجغرافية للوطن العربي. دار الجيل للنشر. بيروت. ١٩٨٨. ص ٤١٣.

٥--د. بسمة خليل نامق الاوقاتي. تأثير مقومات قوة الدولة على سياساتها الخارجية. حالة دراسة «اسرائيل». مجلة المستنصرية للدراسات العربية و الدولية. العدد (٢٩). ٢٠١٠. ص ١١٨.

٦-الفريق اركان حرب سعدالدين الشاذلي. حرب اكتوبر «مذكرات». منشورات مؤسسة الوطن العربي للطباعة و النشر. باريس. بالتعاون مع دار المحرر للطباعة و النشر. بيروت. ط ١. ١٩٨٠. ص ٨٦.

٧- د. سلمان رشيد سلمان. اسرائيل و التسوية. دار الخلدون. بيروت. ١٩٧٥. ص ١٢٨.





ئازاد ئیبراهیم ئەحمەد

# کورد لە بۆشایی میدیای جەنگیدا

میدیای جەنگی یان راگەیاندنی جەنگی جۆرێکە لە جۆرەکانی راگەیاندن و ولاتانی جیهان گرنگیی زۆریان بەم جۆرەی میدیایە داوە. ئەو ولاتانەی کە زۆرترین جار چوونەتە جەنگەوە، زیاتر و زۆرتر بایەخ و گرنگی ئەم جۆرەی میدیا دەزانن، نەک هەر ئەوەش لە زۆربەی ولاتاندا کە بایەخ بە میدیای جەنگی دەدەن هاوکات بایەخ بە رۆژنامەنووس و میدیاکاری بەرەکانی جەنگیش دەدەن تاکو لە کاتە پێویستەکاندا بتوانن روماڵێکی تەواو پرۆفیشناڵانە بکەن کە دووربێت لە مەترسی بۆسەر ولات و سوپای ولاتەکەیان، لێرەشەوە ئەوە جیادەکرێتەوە کە هەموو رۆژنامەنووسێک ناچێتە بەرەکانی جەنگ و هەموو رۆماڵێکیش بە روماڵی بەرەی جەنگ هەژمار ناکرێت. بە درێژایی ئەو کاتانەی پێشمەرگە لە جەنگی داعشدا بووە، هەڵە تێگەشتنێک لە میدیای کوردیدا هەبووە کە پێمانوابووە ئەوەی لە جەنگی داعشدا کراوە میدیای ئێمە کاری روماڵی کردووە، نەخێر، ئەوە روماڵی جەنگی نییە میدیای ئێمە وێنەی هەموو جوڵە و خواردن و خەوتنێکی پێشمەرگە بگەیەنێت بە دوژمن، لە راستیدا کاری روماڵکردنی جەنگ یەکێکە لە هونەرە باڵاکانی

میدیا و ئەو کەس و میدیاکارانەی کە تایبەت دەکرێن بەم بوارە، دەبێت خول و دەورەی ناوخۆیی و جیهانی ببینن و بەناوی رومالەوە کارێک نەکەن کە دژی ئاسایشی نەتەوەیی کورد بێت. وەک چۆن دەزانین لە مەیدانی جەنگدا ئەرکی فەرماندە و قائیدەکانە پلانی وردی سەربازی دابرێژێت و لە هەمووان زیاتر ئاگایان لەهێزەکەیان بێت و نەشکێت و بەکەمترین زیان لە جەنگێکدا بچنەدەرە و سەرکەوتن بەدەستبهێنن. بەو شێوەیەش پێویستە میدیا ئەو کەسانە بنێرێتە بەرەکانی جەنگ کە تایبەتمەندن لە رومالدا و لە هەمووان باشتری لێدەزانن. ئەمەش بۆئەوەی کەمترین زیان. یان هیچ زیانێک بە میدیاکارەکانی نەکەوێت. بەپێچەوانەوە ئەو میدیاکارەی هیچ خولێکیان لەبارەی رومالی بەرەکانی جەنگەوە نەبینی بێت و راستەخۆ بچێتە بەرەی جەنگێکەوە و دەست بکات بە رومال. ئەوا لە یەکەم چرکەی کارەکەیەوە هەڵەی کردووە و پێی ناوترێت رومال. هەموو ئەو بابەتانەی کە پەیوەست بوون بە نەبوونی میدیایەکی جەنگی و نەبوونی پەیامنێر و میدیاکارێکی تایبەتەوە بۆ رووماڵی مەیدانی جەنگ. ئەوە وایکرد میدیای کوردی هێزی

زۆرێکی میدیاکان و میدیاکار و رۆژنامەنووسی کورد تا ئێستاش نازانن هونەری رومالکردن بە گشتی و رومالی جەنگی چییە لە میدیادا! جا نەخاسمە ئەو توانا کەمەی کە میدیاکارەکانی کورد هەیانبوو بنێردرێنە بەرەکانی جەنگ و ئەرکێکی گەورەی پێبسپێردرێت کە رومالی جەنگێکی تاقەت پروکێنە.






پێشمەرگە و خاکی کوردستان و تەنانەت خودی میدیا خۆیشی تووشی زەرەری زۆر بکاتەوە لەو جەنگەدا. بە وردبوونەوە لە جوڵەکانی میدیاکان کاری زۆرێکی میدیاکان دەچوونە خزمەت دوژمنەوە. لەو سەروبەندەدا گلەیی و تووڕەییەکی زۆریش هەبوو کە میدیای کوردی جارێکیتر بەو شێوەیە نەچێتە بەرەکانی جەنگ و وێنەی دیمەنیی جەنگ و چاوپێکەوتنی فەرماندەکان نەگوازێتەوە. ئەمەش دەرئەنجامی ئەو ڕوماڵە هەڵەیە بوو کە میدیاکانی کوردستان دەیانکرد لە بەرەکانی جەنگەوە.

ڕەنگە زیادەڕەویمان نەوتبێت کە زۆرێکی میدیاکان و میدیاکار و ڕۆژنامەنووسی کورد تا ئێستاش نازانن هونەری ڕوماڵکردن بە گشتی و ڕوماڵی جەنگی چییە لە میدیادا! جا نەخاسمە ئەو توانا کەمەی کە میدیاکارەکانی کورد هەیانبوو بنێردرێتە بەرەکانی جەنگ و ئەرکێکی گەورەی پێبسپێردرێت کە ڕوماڵی جەنگێکی تاقەت پڕوکێنە.

لە وڵاتاندا، پرسی میدیای جەنگی بە یەکێک لە پاڵنەرەکانی سەرکەوتنی وڵات لە هەر جەنگێکدا دادەنرێت و بایەخی تەواویش بەمجۆرەی میدیا دەدرێت. بەمانایەکی دیکە دەوترێت هێزی میدیا هێزێکی کاریگەرە لە پشتەوەی سوپاوە. ئەم بۆچوونە زۆر ڕاست و دروستە بە نیسبەت کوردیشەوە. لە شۆڕشی گەلی کوردا ئەوەی کورد هەیبووە ڕادیۆیەک

بووە و هیچی دیکە تا راپەڕین. بەڵام کاریگەری ئەم رادیۆیە لەسەر ورە و مەعنەوییەتی پێشمەرگە زۆر کاریگەری هەبووە و دەتوانین بڵێین ئەوەی بە هێزی رەقمان بەدەستمان هێنا بەشێکی پاڵنەرە میدیاییەکەی بووە تاکو راپەڕین. بەڵام جیاوازی ئەو رادیۆیەی جاران و میدیای ئێستامان ئەوەیە کە رادیۆکە هیچ دیمەنێکی هەڵەی هێزەکانی پێشمەرگەی نەگواستۆتەوە و جوڵە و هێرش و چرکە چرکەی جوڵەکانی فەرماندە سەربازییەکانی پێشمەرگەی بۆ دوژمن نەگواستووەتەوە بە قسە.

لە کوردستان بەو پێیەی میدیایەکی جەنگیمان نییە وەک ئەوەی لە هەندێک وڵاتدا هەیە بەناوی «ناوەندی میدیای جەنگی»، ئەوا میدیاکاریشمان نییە لەم بوارەدا پرۆفیشناڵ و تایبەتمەند بێت. ئەم جۆرەی میدیا لە نێوان جۆرەکانی دیکەی میدیای کوردیدا پشتگوێ خراوە و بەپێی ئەو پێگە جەنگییەی کە کوردستانی تێکەوتووە و زۆرترینجاریش لە ساڵەکانی رابردوودا تووشی پێکدادان و جەنگ بۆتەوە. دەبوو حکومەت و لایەنی پەیوەست بەم بابەتە کە رەنگە وەزارەتی پێشمەرگە بێت. بیریان لە میدیایەکی لەم شێوەیە بکردایەتەوە و رۆژنامەنووسی تایبەتیشیان بەم بوارە پێبگەیاندایە و بیاننادرنایە بۆ وڵاتانی دەرەوە تاکو خولی تایبەت ببینن.

نەبوونی ئەم جۆرە میدیایە بۆ کورد. یان نەبوونی ناوەندێکی میدیای جەنگی لای کورد. نەک لە رابردوودا شوێنەوارە نەرێنییەکەیمان بینیووە. بەڵکو لە داهاتووشدا زیاتر هەستی پێدەکەین و زۆرتریش دەبێتە مایەی مەترسی بۆسەر هەرێمی کوردستان. چونکە میدیاکارەکانمان نەک پسپۆڕی و لێزانینیان بەم بوارە نییە بەڵکو ئەوەشی کردوویانە لە رابردوودا جۆرێک بووە لە کارکردنی ناچاری و جۆرێک بووە لە جاسووسی ناڕاستەوخۆش بۆ دوژمنانی گەل و خاکەکەمان. پێویستە ئیدی ئەم کارکردنە ناشارەزایانەیە رابگیرێت و ئیدی هەرکەسە و بۆ خۆی کاری روماڵ لە بەرەکانی جەنگدا نەکات و کەسیش بەناوی رۆژنامەنووسەوە تووشی کارەساتی گیانی و رۆحی نەبێتەوە و هێزی پێشمەرگەش بەبۆنەی هەڵەی میدیاکارەکانمانەوە تووشی نارەحەتی و ئازار نەبنەوە.





# نۆزده

نـۆزده چـاو هەڵـۆی تیپـی ٩٣ی کۆیـه. لـه ١٩٨٦/١١/١٩ بـه نوێـژی نیوەڕۆیـه. لـه چەقـی سـەرجادەی سـەرەکی دۆڵـی (شـاڵبەگیان) چەقیـن. وەک میـن لـه کەمیـن ڕووبـەڕووی سـوپای دوژمـن دا تەقیـن. لـه بۆسـەیەکی تۆکمـه و دامـەزراو. لـه کاروانێکـی سـەربازی چاوەڕواننەکـراو ولەنـاکاو. لـه دەمژمێـری دوو ونیـوی پاش نیـوەڕۆ. کاروانـی سـەربازی کەوتە بـەر هەڵمەتـی چنگـی نـۆزده هەڵـۆ. بـوو بە تەقـه وهێـرش لـه ئاسـت گونـدی (کانـی وەتمـان). کاروانـه سـەربازەکە پـڕ ئازووقـه و تەقەمەنـی بـوو بـه باتمـان. لێیـان هاتنـه دەسـت و گورزێکـی گـەوره و دەگمەنیـان لـێ وەشـاند. ١٩ پێشـمەرگە لـه ١٩ی مانـگ ١٩ئیڤایـان تێکشـکاند و سـوتاند. ١٩ ئەفسـەر و سـەرباز کـوژران. شـەش کەسیان لـێ بەدیل گیـران. دەسـکەوت ٢٣ کلاشـینکۆف و دوو R.B.G و یـەک دەمانچـه و یـەک جیهـازی ڕاکاڵ. خەسـارەت د.کاوەی دلێـر بـوو بـه گولاڵـه سـوورەی کۆتایـی سـاڵ. لەگـەڵ بریندابوونـی پ.م قاسـم حەمـه گچکـەل. پێشـتر لـەو شـەڕە د.کاوه و چارەی دەیکـرد بـه تیمـار و تەقـەڵ. بـەڵام عەجەلـه و ئەجـەل بـران. خوێنـی شـەهیدان ڕووناکـی چـران. بـۆ ئـازادی و سـەرفرازی. بۆسـەربەرزی مایـەی شـانازی. شـەهیدان لـەدوای مـەرگ لـه دایـک دەبنـەوە. لەیـادو ویـژدان دەژیـن هەرگیـز لەبیرناچنـەوە. چـاک نوسـین واتـه چـاک و پـاک وەک بیرکردنـەوە. ئـەوەی شـایانی گێڕانـەوە بـێ دەبـێ وەک خـۆی بیگێڕینـەوە. بەجوانـی و سروشـتی و دروسـتی شـیبکەینەوە. ڕۆژانـی





هەڵوێست و جوامێری وخۆنەویستی بەبیربهێنینەوە.

باڵندەی دیکە هەیە دەفڕن بەرزتر، بەڵام وەک هەڵۆ چنگ بە گرنین نە بەهێزتر. ڕاستە د.کاوە ناونرابوو بە ناوی کاوەی ئاسنگەر، چەکووش و بەرکۆشی پێ نەبوو پێی بوو چەک و هەگبەی پڕ دەرمان و شرینقە و چارەسەر. ناسرابوو بە کاوەی دلێر، جوامێر و شێر و بوێر، چوستو چالاک و بەدەستو برد. بۆ خەڵک و پێشمەرگە ببووە دارگورد و پرد. دەرچووی پەیمانگای پزیشکی بوو. لە کاری دکتۆری و چالاکی پێشمەرگانە پشکی بوو، نموونە بوون لەو جۆر، پێشمەرگە و دکتۆر، لەگەڵ (د.هۆشمەند عەبدولکەریم) ناسراو بە دکتۆر شالاو. یەکەم خەستەخانەیان دانا لەناوچەی ڕزگارکراو، لەدۆڵە ڕەقە لەناو گوندی (پلێنگان)، لە سنووری هەرێمی چواردەی ناوشێر و پلێنگان، بەهیمەت و هاوکاری فەرماندەی هەرێمی چواردە، (سواراغای عەباساغای سەرکەپکان)، ببوونە هێمای مرۆڤایەتی لەناوجەرگەی جەماوەر ورە و هیوا لە هێرش و شەڕەکان، بۆ نەخۆش و بریندارانی پێشمەرگە و جەماوەر، قەڵاو ئومێدبوون بۆ تیمار و چاکردنەوە و چارەسەر.

مرۆڤی سەرکەوتوو قەت ناکرێ قوفڵ، پەنجەرەی نوێ دەکاتەوە بۆ تیرۆژ و دیمەنی گوڵ، گوڵچن لە دڕک ناترسێ، لەئازار و ماندووبوون ناپرسێ، کە حەزرەتی (نوح)کەشتیەوان بێ هێندە مەترسی



نییە لافاو، هەموو گوڵێک جوانە بەڵام گوڵ بۆنی نەبێ نابێ بە گوڵاو، پشتت کێوبێ، با دژمن دێوبێ. د.کاوە لە دڵێکی پڕ سۆز و سووتاو، لە جەستەیەکی بەهێز و چەسپاو بە پاکی، بێ باکی، بەچاکی، بە چالاکی، کەوتە ناو خەباتی پێشمەرگایەتی و کوردایەتی. بە گیانی سۆز و ویژدانی دکتۆری میهرەبان و مرۆڤایەتی.

لەبن پەری هەورو ساماڵان دۆزرایەوە، بە دکتۆری تیپی ٩٣ی کۆیە گیرسایەوە، بەدروشمی (کەم بژی و شێر بژی، نەک زۆر بژی و لەژێر بژی). بەدەرزی شرینقەو شرقەی تفەنگ سەلماندی بەکردەوە، خەستەخانەی شەهید د.خالیدی لە گوندی (کانی کوردە) کردەوە، بوە یەکەم تیپ خەستەخانەی هەبێ، پێداویستی نەخۆش و دەرمانخانەی هەبێ، خۆی چارەسەر و تیمارکەری برینان بوو، بۆ پێشمەرگە و خەڵک چارەسەر و دەرمان بوو.

دایک و کەسوکاری پێشمەرگە دڵ و دەروون وچاویان کەوتبووە دەشتو کەژان، لەهەر هەواڵ و ڕووداوێ ڕادەچەڵکین و دەشڵەژان و دەهاتنە هەژان. دایکە جگەر سووتاوەکەی (ئامینەخان)لە ساڵرۆژی شەهیدبوونی لە هەمان ڕۆژ و کات، دڵە برژاوەکەی لە لێدان کەوت ١٩٩٧/١١/١٩ بەوەفاوە کردی وەفات. د.کاوە لە کن نۆزدە شەهیدەکەی داستانی قوڕە بەرازە



نێژرا. لەداخی شەهیدبوونی ئاخی بۆ هەڵدەکێشرا و فرمێسکی بۆ ڕێژرا، پاش شەهیدکرانی لە دەم زێ (فەتاح تەپڵ) هەواری تازە. بۆ خۆشەویستی و ڕێز و وەفا بۆ ئەو مەبەست و نیازە، کتێبخانەیەکی بۆ کراوە، بەناوی شەهید (د.کاوە)بەڵام لە ئەنفالەکان ئەنفالکرا. کتێبەکان سوتێندران و جێیەکە تێک و پێک درا. بۆیە دیسانەوە لەناو شاری کۆیە لە شوێنەواری قشڵە، کتێبخانەی شەهید د.کاوە دامەزرایەوە رازایەوە لەجوانی وجۆری کتێب چەپکە گوڵە. ئەو نۆزدانە هەڵبەستراو نین و ڕاست و دروستن. بۆ لاپەڕەی مێژوو بایەخدارو جێی سەرنج و

پێویستن! چاوەکان چەند گەورەبن ناتوانن یەکتر ببینن. خۆشەویستان نزیک بن یان دوور لەناو دڵان شیرینن! بەهەور و بەسایەقە. گوڵ هەر گوڵی لایەقە! زامی شەهیدەکان هەرگیز نابێ ساڕێژ. یادیان بەخێر و بەڕێز و دڵبرێژ!!

١٩ نۆزدە هەڵۆیەکە:

١- شەهید د.کاوە عەبدوڵڵا
٢- شەهید حاجی شەفیق تۆفیق ئیسماعیل زریان
٣- شەهید بەکر ئەحمەداغا غەفووری
٤- شەهید مەلا عوسمان کانی بی
٥- شەهید سەید مەغدید سەید قادر
٦- شەهید حەمەتایەر حەمید
٧- شەهید (عومەرە سووری کانی بی)هەمزە اغا-گیڤارا
٨- ڕەهبەر سەید برایم (فەرماندەی تیپی ٩٣ی کۆیە)
٩- دڵسۆز بەکر فەتحوڵڵا (ف.کەرت)
١٠- پشتیوان همزە رسول (کەم ئەندامی سەنگەر)
١١- سەرباز حاجی سایەق
١٢- خالید عەبدولرەزاق حەمە سدیق
١٣- شۆرش کاکە (بەڕێوبەری پۆلیسی دارستانی ڕاپەرین)
١٤- سەید گوڵ سەید ئەمین داوداوە
١٥- حەمە هەڵدێر حاجی حەسەن کورتاندروو
١٦- قاسم حەمە گچکەل
١٧- دڵزار کاکەمین
١٨- عومەر عەلی حسین(هەڵۆ ڕەش سارتکەیی)
١٩- شاخەوان حەوێز (شاخە ڕەش)

## بیرەوەرییەکی ڕۆژانی پێشمەرگایەتیم

# چۆن دکتۆرێک بووم

نەورۆز زڕگوێزی

کە ئاشبەتاڵ ڕویدا و کوردستان بووە مەیدانی تەراتێنی بەعس. ڕژێم بۆ پیشاندانی دلسۆزی بۆ کورد و هەڵخەلەتاندنی وڵاتانی دەرەوە. چەند کارێکی کرد. دروستکردنی هەندێ بنکە وەک خەستەخانە و قوتانخانە و لە هەندێک شوێن بەشی کشتوکاڵ و (بەیتەرییە). کەم و زۆر دابەش کرابوون بەسەر ناوچەکاندا. دوای گەشەکردنی شۆڕشی نوێ. بەتایبەتی دوای هەڵگیرسانی جەنگی تاقەت پڕوکێنی( ئێران - عێراق ) ڕژێم زۆر ناوچەی چۆڵ کرد و هەندێ ناوچەش بەخوێنی تێکۆشەرانی کورد ڕزگار کراو ڕژێم نەیتوانی جارێکی تر بێتەوە تا کارەساتی ئەنفال. ڕژێم ئەو بنکە خزمەتگوزاریانەی گواستەوە ژێر دەسەلاتی خۆی. لەبەر ئەوەی شۆڕش سوودیان لێوەر نەگرێت. بەم هۆیەوە جۆرێکی تری چالاکی پێشمەرگە زیادی کرد. کە دەست بەسەر نەخۆشخانەکانی ژێر دەسەلاتی ڕژێم بگرن و بیگوێزنەوە بۆ ناوچە ئازادەکان. کە ئەمەش سودێکی زۆری گەیاند بە شۆڕش و دانیشتوانی ناوچە ئازادەکان. کە توانرا لە زۆر شوێن خەستەخانەی شۆڕش دابمەزرێت و بە ئامێری پێشکەوتوەوە.

زۆر جار دڵسۆزانی ڕێکخستنەکان ڕێگە نیشاندەر بوون کە چ خەستەخانەیەک باشە بۆ دەستبەسەرگرتنی و گوێزانەوەی بۆ ناوچە ئازادکراوەکان. کە بەبێ تەقە جێبەجێ دەکرا. ئەوکات خەستەخانە لاوەکییەکان. شەوانە تەنها (حەرەسێک) دەمایەوە. تا توشی لێپرسینەوە نەبێت. لە ژوورێکدا زیندانیان دەکرا. تا ڕژێم شک

لـە پارمەتـی ئـەوان نـەكات و بیانگـرن. بـەم هۆیـەوە پێشـمەرگە دكتـۆر و برینپێچـەكان دەیانتوانـی زیاتـر خزمـەت بـە هێـزەكان و جەماوەرەكـە بكـەن. كـە دواتـر دەیـان بنكـەی گـەورە دروسـت بـوون لـە مەڵبەنـدەكان و گـەورەترینیـان خەسـتەخانەی سـەرەكی لەبەرگەڵـوو دروسـت كـرا.

كارمەندانـی نەخۆشـخانەكانی شـۆڕش سـەدان نەشـتەرگەری گەورەیـان بـە ئەنجام گەیانـدوو سـەدان گیانیان ڕزگار كـر. بەداخەوە ئـەو كارە پـڕ جوانـی و مرۆڤایەتیەیـان وەك پێویسـت بـۆ مێـژوو تۆمـار نەكـراوە. بەهـۆی سەركێشـی هێسـترێكی چەمووشـی هاریـوو، كـە چەنـد مانگێـك بـەس خزمـەت دەكـراو دابەسـترا بـوو كـە بەفـری زۆری باریـوی چەنـد مانگـەی ناوزەنـگ بـووە خێـر بۆیـی و هـەر لـە گەوەرەكـەدا دەلـەوەری هەتـا ئاویشـی بـۆ دەبرایـە ژوورەوە. لـەو مـاوە زۆرەدا تەنهاعەسـرێك كارمـان پێـێ بـوو .كردمیـە فلیـم و بوومـە قوربانـی و قۆڵێكـم نایـە بانـی. برامـە نەخۆشـخانە ساواكەی شـێنێ و لـەوێ وێنـەی تیشـكیان بـۆ گرتـم و چەنـد ڕۆژێـك لایـان مامـەوە. ئـەوكات كاكە(حەمـە بەیـان ) لـەوێ بـوو. بەڕێزیـان كـوری شـار و سـەرچناریە دێرینـەكان و یەكتریمـان بـاش دەناسـی و لەبەشـی تیشـك خزمەتـی دەكـرد. بـەو هۆیـەوە ئاشـنایەتیم لەگـەڵ بـرا دڵسـۆزەكانی نەخۆشـخانە پەیـدا كـرد كـە

**د. ئاكۆ: وتی ئەوە چەند ڕۆژە فێـرت دەكـەم، دەبـێ ئەمـڕۆ دەرزی لـێبدەیت، بەڕاسـتی مـن ئامـادە نەبـووم، بـەلام دەبـوو تاقـی بكەمـەوە، ئـەوەم قبوڵ كـرد بەمەرجـێ لەژێـر ئـاگاداری ئەودا، چونكـە دەمزانـی دەرزیەكـی هەڵـە دەتوانـێ گیانێـك لەنـاو بەرێـت.**

تا ئەنفال و دواتریش. ڕۆژگاری گرگرتوی خەبات بەخێرایی گەشەی دەکرد کە خوێن و هیلاکی و دڵسۆزی داینەمۆی بوو. وتی / تۆ بەردەوام سەردانمان دەکەیت و هەندێ جار پێشمەرگەو جەماوەری بریندار و نەخۆش دەگەیەنیتە لامان. وەک (ئامبولانست) لێهاتووە. بۆ نایەیت هەندێ خزمەت گوزاری سەرەتاییت فێر بکەین. کە بەسوود دەبێت بۆ بریندار و نەخۆشەکان تا دەگەنە لامان. سەرەتا گاڵتەم بە تواناکانی خۆم دەهات لەو بوارەدا. بەلام بە دلسۆزی و هاندانی ئەوان. گەشتمە ئەو بڕوایەیی کە ڕاست دەکەن. هەر نەبێت دەتوانم خزمەتێکی بچووک بکەم و ئازارێک یان ژیانێک ڕزگار بکەم.

کە گەڕامەوە (کوروان) لە ئاوەژێ بە کاک نەوشیروانم وت. ئەو پێێ باش بوو. بڕیارم دا هەوڵ بدەم و شتێک فێر بم کە بەهۆیەوە خزمەتێک بە گەلەکەم بکەم. سەرەتا وتیان دەبێ بێیتە لامان و گوێ بگریت و دواتر فێری دەرزی لێدان و تیمار کردن و برین پێچان و هەناسەی دەستکرد ببیت. ئەوان ڕۆژانە لە خەستەخانەکەی( مەرگە) خزمەتیان دەکرد. باڵەخانەیەکی بچووک بوو. بەلام جێگەکەی باشی هە بوو. بەلام ڕۆژانەقەرەباڵغیەکی زۆری تێدا بوو. دکتۆر ئاکۆ لە بەشی دەرزیو برینپێچی بوو. بە قسە و وێنە کێشان فێری کردم کە چۆن و لە کوێ دەرزی دەدرێت. چۆن دەتوانی دەرزیەکان بەکار بهێنییت. ماوەی چەند ڕۆژێک بەس سەیرم دەکرد. ئەوکات دکتۆر (ڕۆبی سپێ) نەبوو تا بناسرێتەوە. بە جلی پێشمەرگانەوە خزمەت دەکرا. وتی ئەوە چەند ڕۆژە فێرت دەکەم. دەبێ ئەمڕۆ دەرزی لێبدەیت. ئەمە وتەی د ئاکۆ بوو. بەڕاستی من ئامادە نەبووم. بەلام دەبوو تاقی بکەمەوە. ئەوەم قبوڵ کرد بەمەرجێ لەژێر ئاگاداری ئەودا. چونکە دەمزانی دەرزیەکی هەڵە دەتوانێ گیانێک لەناو بەرێت. د ئاکۆ وتی دەی وا دەکەم خۆ نایەڵم خۆت نەزانانە دەرزی بوەشێنیت. بڕیار بوو نەخۆشی ئایندە من دەرزی بۆ بکەم. کە هاتنە ژوورەوە ژنێک و منداڵێک بوون. دەرزیەکە بۆ منداڵەکە بوو. جا ئێمەی کورد و ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستی لە نەزانینمانەوە منداڵمان بە شەو لە بان و دەرزی و دکتۆر و جنۆکە و شەیاتن ودێوەکە ترساندووە. کە تا ئیستەش ڕەنگدانەوەی لەسەر نەوەکانی ئێمە هەیە. منداڵی ترسێنراو. وەک منداڵی خۆم. بە ڕاست و چەپا دەجوڵاو هاواری دەکرد. دوای ئەوەی دەیزانی دەرزی لێدەدرێت. ئیتر بە دایکی و من و دکتۆر ئامادەمان کرد.

د ئاکۆ وتی / سەیر کە بزانە کوێی و

**ئـەو دکتـۆرە بەڕێزانـەی شـۆڕش، یـەک بەیـەک پیـاوی تـــــیکۆشەرو دڵســۆزی مرۆڤایەتـی و شـۆڕش بـوون. مایـەی ڕێــز و پێـــــزانینن، چونــــــــکە ئـەوان سـوێندیان خـــواردووە کــە دڵسـۆزی کاریـان و خزمەتـی نەخــــۆشەکان و نهێنیەکانیـان بــن و دوور بـن لـە دەمارگیـری نەتەوایەتــی.**

چـۆن دەرزی لێدەدرێـت. کـە پێشـتر بـۆی بـاس کردبــووم. د. ئاکــۆ دەســتی چەپــی بــردوو و ســمتی منداڵەکـەی تونـد گــرت و دەرزی تێچەقانــد. هــاواری منــداڵ و چوولەکــەی سـوودی نەبـوو. دەرزی ڕاکێشـرا و خوێـن نەهـات و دواتـر دەرمـان کرایـە لەشـیەوە و بـە لۆکەیەکـی ئسـپرتۆ کـراو منـداڵ بـە زیـرە زیـر لـە ژوو وەدەرکـەوت. ئەمجـا نـۆرەی تۆیـە دەرزی لێبدەیـت. ئـەوە بـە قسـە و کـردار فێـرم کردیـت. هەوڵبـدە و ووریابـە. زوو فێـر دەبیـت بێشـکم هەڵـە ناکەیـت. ناوچەوانەکـەم باشـی نەهێنـا. ئەگـەر چـی دەترسـام. بـەڵام د. ئاکـۆ زۆر پشـتگیری کـردم. دەی بریـار درا دەسـت بـەکار بـم و خـۆم ئامـادە کـردووە. شـەرمە فێـر نەبـم. هێشـتا خەریکـی قسـە و فێربونـی زیاتـر سـەقاڵی کردبوویـن. لـە دەرگـا درا و د. ئاکـۆ فەرمـووی لــێ کــرد. ژنێکـی گەنـج هاتـە ژوورەوە. د. دەرزیـم هەیـە. د. ئاکـۆ وتـی ( ڕووی لـە مـن کـرد) ئـادەی دکتـۆر ئـەو دەرزییـەی بـۆ بکـە. هـەم شـەرمم دەکـرد و هـەم بـڕوام بـە خـۆم نەبـوو. ئـەی خوایـە دوای منـاڵێک نەدەکـرا چەنـد پیاوێـک بێـت بـۆ یەکسـەر ژنێـک هـات ؟ کـە ئـاوڕم دایـەوە ئەوەنـدەی تـر تێـک چـووم. ژنـەی نەگبـەت وتـی. دکتـۆر ئەمـە کـەی دکتـۆرە. ئێمـە هـەر تـۆ دەناسـین. د. ئاکـۆ زوو وەڵامـی دایـەوە و وتـی ئەمـە دکتـۆری تازەیـە هاتـووە. بۆیـە نـای ناسـن. ئـای کـە سـەخت

بوو. ژنەی قوربەسەر، کەوتە کەوانەی دەرزی لێدانەوە. نەک وەک منداڵکە بەڵکو وەک هەموومان هەر بە پێوە. بەشێکی چوارینەی سمت بەسەر بۆ دەرزی وەشاندن. دەربڕێ داماڵراو و منیش پێشتر دەرزیم لە سرنجا ئامادەکرد و هەوام لێدەرکردبوو. وەک دەڵێن خوا کردنی د. ئاکۆ لە تەنیشتمەوە بوو. پێش دەرزی چەقاندن، دەستم برد بۆ سمتی تا وەک منداڵەکە سازی کەم بۆ دەرزیەکە. بە توندی درا بە دەستما. کە سەرم هەڵبڕی د. ئاکۆ بە ئیشارەت وتی. پێویست ناکات. تێێ چەقێنە و رایکێشە و گەر خوێن نەبوو. بە هێواشی دەرمانەکەی تێکە. هەر زوو ئارەقەم دەردا و لەرزەم تێکەوت. هیوادار بووم یەک ملیم بوایە و زوو تەواو بوایە. ژنە نەلە لێدان و نە لە تەواو بووندا کێشەی نەبوو. دەست خۆشی لێ کردم و ڕۆشت. د. ئاکۆ لە من زیاتر ئارەقی کردبۆوە. هەردوکمان لە کار و کەسایەتی خۆمان دەترسابین کە کارەکە بە هەڵە لێکدانەوەی بۆ بکرێت. هەردوکمان ئاهی حەسانەوەمان هەڵکێشا. وتی کوڕی خوا خۆ ئەو منداڵ نییە بۆ خەریک بوو سمتی بگریت ؟ وتم دکتۆر بڕوا بەخۆم ناکەم وام زانی دەرزی لێدان وەک منالەکەیە. دوای چەندین دەرزی و برین پاککردنەوە و پێچان. دەبوو بچمە لای د. شوان.

ئەو دکتۆرە بەڕێزانەی شۆڕش. یەک بەیەک پیاوی تێکۆشەرو دڵسۆزی مرۆڤایەتی و شۆڕش بوون. مایەی ڕێز و پێزانینن. چونکە ئەوان سوێندیان خواردووە کە دڵسۆزی کاریان و خزمەتی نەخۆشیکان و نهێنیەکانیان بن و دوور بن لە دەمارگیری نەتەوایەتی. وتی بەس گوێبگرە تا شتێک فێر بیت ؟ ئەوە قسەی د. شوان بوو کە ماوەیەکی زۆر ڕۆژانە لەوێ خزمەتی دەکرد. د. شوان هاوخەباتێکی دێرینم بوو. کە زۆر پێش ئەو کاتە دەمناسی. بەڕیزیان کوری لەسەرخۆ و حەزی بە قسەی خۆش بوون. هاوکات زۆر دڵسۆز بوو و ئارەزووی دەکرد چی لایە بیخاتە خزمەتی شۆڕش. لەگەڵ هاوکارەکانی خزمەتێکی پڕ شانازیان کرد.

پیاوێکی گوندێکی سنورەکە بە منداڵێکی ساواوە هاتە ژوورەوە هەتا بڵێێت کەسێکی جوان و لەش و لارێکی جوانتر. منداڵێکی ساوای بە باوەشەوە بوو. دکتۆر خستیە سەر قەروێڵەکەو. زۆر فەحسی کرد. کە دانیشتەوە وتی. چ کارەیت ؟

د. گیان شوانم.

د. وتی / باش گوێ بگرە ئەم منداڵەتان پێویستی بە گرنگی پێدانی زۆر هەیە. دەبێ ڕۆژانە چارەسەری بۆ کرێت دەنا

ڕەوشـــی خراپتـــر و لەوانەشـــە بمرێـــت.
بـاوک / بەڵـی دکتـۆر گیـان ڕاسـت دەکـەیت بـەڵام بەخـوا کاتمـان نییـە خەریکـی منداڵەکـە بیـن.
د شوان / چۆن کاتت نییە.
د گیان /خۆم و ژنەکەم خەریکی کارین.
خـۆم شـوانم و ژنەکـەم خەریکـی دۆشـین و خزمەتـی تـر و مانـگاو مەڕەکانـە. منـی گوێگـر هـەر جارەی ڕوم بـەلای یەکێکیانـدا دەگـەڕا.
د. شـوان ئـەو چەنـد تاڵـەی قـژی چووەبـووە ئاسـمان. هـاواری کـرد ئـەی بـێ ئەقـڵ پێـم بڵـێ ژیانـی منداڵەکـەت گرنگتـرە یـان هـی ئاژەڵێـک. بـۆ وا بێقیمەتانـە لـە خۆتـان دەڕوانـن. تێگەشـتم کـە هـەردوو لایـان حەقیانـە بـە تیگەشـتنی جیـاوازەوە.
بـاوک جگـە لـە خەمـی ژیانـی خۆیـان. خەمـی منداڵیشـی هاتبـوە سـەر. دیـار بـوو نەیدەویسـت کارەکـەی لەدەسـت بـدات.
د شـوان هێشـتا بـڕوای نەدەکـرد. وتـم / دکتـۆر گیـان خـۆت تـورە مەکـە. تێگەشـتن و سـەختی ژیـان وادەکات مرۆڤـەکان و بیرکردنەوەیـان جـوودا بێـت.
وتی / ئاخر ژیانی منداڵێکە ؟
وتم دیارە هۆکاری خۆی هەیە.
هەستام و وتم ئیتر نایەم بۆ لات تۆبە.
وتـی جـا چیـت دیـوە .. لێـرە بیـت مێشـکت تیـا نامێنێت.

دوای چەنـد جارێـک و شـتێک فێـر بـوون. سـندوقێکی فیشـەکمان پڕکـرد لـە دەرمـان و دەرزی و لەفـاف. جـۆر و شـێوەی بـەکار هێنانیمـان نوسـی. خۆشـبەختانە بـۆ کارەسـاتی گـەورە بـەکارم نەهێنـا. کارمەندانـی نەخۆشـخانەی شـۆڕش. قارەمانیەتـی گەورەیـان نوانـدووە. هـەر لـە کۆڵەپشـتی نـاو چالاکیـەکان تـا نـاو نەخۆشـخانەکانی شـۆڕش. کـە نەشـتەرگەری وا گرنگیـان ئەنجـام دا کـە لـەلای ڕژێمیـش لـەوە باشـتر نەدەکـرا کـە دەیـان نموونـە هـەن. دروود بـۆ گیانـی شـەهیدەکانیان و بەختـەوەری بـۆ شـەهیدە زیندووەکانیـان. ئـەوان مایـەی ڕێـزی زۆرن.



بەشی سیانزەیەم

سەربەست بالکی

# سەربازە ونەکان

لەدەیەی حەفتا و هەشتاکانی سەدەی ڕابردوودا ڕەوشی سیاسی عێراق و کوردستان وای کرد هەزارەها گەنج وتازە پێگەیشتووی والات لەڕێڕەوی ئاسایی ژیان لایاندا و پەرتەوازەی ژیانی ناهەمواری بوون، منیش ئەوکاتەو لەتەمەنێکی کەمەوە بووم بە پێشمەرگە و تێکەڵی شۆڕشی چەکداری بووم لەڕیزەکانی یەکێتی نیشتیمانی کوردستاندا،بەبێ ئەوەی بەدەست خۆم بێت بووم بەکارەکتەر و بەشداربووی دەیان شەڕی سەخت و خویناوی، دەیان کارەسات و چرکەساتی مەترسیدارم بینی،ئەوەی کەمنی پێشمەرگەیەکی سادەی کەم تەمەن بینیومە و تیایدا ژیاوم ڕەنگە لەناو کتێب و بیرەوەریەکانی لێپرسراوانی ئەوێ ڕۆژێ باس نەکرابێت و چوبێتە خانەی فەرامۆشیەوە . بۆیە بڕیارمدا ئەورۆژگارە سەخت و ڕۆژە خویناویانە بهێنمەوە یادی خۆم و بەبێ زیادکردن و وەك خۆی بیاننوسم.کەئەوەش بەشێکە لەمێژووی ئەم گەلە.



دوای دە ڕۆژ مانەوە لە گوندی گوێزێ خۆمان کۆکردەوە و بەرەو شاخی تاتی دۆ بەڕێکەوتین. ئەم ڕێگەیە کە ڕێگەیەکی دوور و کوێستانییە. بە دەیان ماڵە مەڕدار و ڕەشماڵ نشین ئاوەدانە. لەم ماڵانەدا پشووماندا و خزمەتی زۆرکراوین کە دەیان چیرۆک و بیرەوەری جوانمان هەیە و بیرناچنەوە. لە تاتی دۆوە هاتینەخوارەوە بۆ گوندی سورەدێ. ئێرە بۆتە بەشی دواوەی شەڕگە. سەکردایەتی شەڕگە و نەخۆشخانە و ئیدارە و نانەواخانە و چەندین بارەگای تری لێدانراوە. شەڕ لە هەردوو شاخی کونەکۆتر و ساوێن گەرمە. ئێرە دواهەمین سەنگەری بەرگری و دواهەمین ناوچەی ئازادکراوی سنورەکەیە. هێزەکانی سوپای دووژمن لە هەموو لایەکەوە هاتوون و لێرە کۆکراونەتەوە بە هەموو تۆپخانە و جبەخانە و فڕۆکە جەنگییەکان. بە هەموو جەنەراڵ و فەرماندەکانیان. ڕەنگە هەموو سوپای عیراق هاتبن بۆ ئەم بەرەی شەڕە. لای ئێمەشەوە زۆرێک لە سەرکردایەتی شۆڕش و فەرماندەکانی ناو هێزی پێشمەرگە لێرە کۆبوونەتەوە و ئامادی بەرگرین. بۆ هەردوولامان کۆتا شەڕە و شەڕی چارەنوسسازە. ئێمە لە سورەدێ لاماندا و بە دەستی چەپدا

**تەنیا ڕێگاکە لێوەی هاتووچۆ بکەین هەر ئەو باریکە ڕێگەیەیە کە بەرەو سورەدێ دەڕوات، واتا ئەگەر ڕێگەی لای سورەدێ بیگرێ ئەوا ڕێگەی گەڕانەوە و دەرچوونمان لێدەگیرێت، بەڵام ئەو کاتە کەس بیری لەوە نەکردبۆوە.**

لامانکردەوە بەرەو شاخی ساوێن ڕۆیشتین، دەنگی ڕتڵە تۆپەکان و دەسترێژە بەردەوامەکانی گوللە لە هەردوولای شەڕەکەوە دەنگی ئەدایەوە و دووکەڵ و تەپوتۆزییان بەرزئەکردەوە، ئێمە بەپێز و بەخێرایی بەرەو شاخەکە ئەڕۆیشتین، دوای نیوەڕۆ گەیشتینە سەر شاخی ساوێن، باریکە ڕێگایەکرد بە ناو دار و نزار و بەردەلاندا بەرەو سەنگەرەکانی ئەبردین، یەکەم ڕیزە سەنگەر و کۆمەڵە پێشمەرگە و کۆی چاو لەسەر دووژمن و سەرقاڵن بەرگری تیپی ٣١ی سلێمانی بوو لێمان دەرکەوتن و لە نزیکیانەوە ڕەتبووین چەند سەد مەترێک لەولاترەوە گەیشتینە تیپی ٤٧ی پیرەمەگرون کە ئەمانیش کۆمەڵێک سەنگەریان قایم کردووە و بەرامبەر دووژمنیان گرتووە، لێرە لاماندا پاشان ئێرە بوو بە شوێنی ئێمە، لەم دیوی سەنگەرەکانەوە کەپرێکیان بۆ پشوودان و حەوانەوە دروستکردبوو کە هەموو ئەو پێشمەرگانەی لە پشوودابوون بەڕێزێکی لاکێشەیی دانیشتبوون، کە چاوییان بە ئێمە کەوت هەموویان خۆشحاڵ بوون و لە پێشوازیماندا هەستانە سەر پێ، ئێمەش لاماندایە لایان و لەگەڵ

سڵاوێک بەڕێز لەم سەر تا ئەو سەر تەوقەمان لەگەڵ کردن دوایین کەس من بووم کە بیکەیسی یەکەم خستە سەر شانی چەپم بە سڵاو و تەوقەکردنەوە پیایاندا هاتم تا لە کۆتا کەسییانەوە ڕەتبووم کە هەموویان هاوڕێ و خۆشەویستمان بوون، وتم با شوێنی خۆمان ببینم و بیکەسی یەکەم دابنێم ئەگەڕێمەوە، ئیتر ڕۆیشتم نزیکەی بیست مەتر دوورکەووتبوومەوە لەم کاتەدا یەک تۆپی سەد و بیست لێیدان هەموویان بەرکەوتن و کەوتن، هەر خێرا گەڕامەوە و بیکەیسییەکەم دانا و چووم بە هانایانەوە هەموویان هەریەکە لە شوێنێکەوە برینداربوون خوێنییان لێئەچۆڕا، هەموو هاوڕێیان و دکتۆرەکانیش هاتن و دەستکرا بە هاوکاری و تیمارکردنیان، خۆشبەختانە کەس شەهید نەبوو، بەڵام برینی زۆربەیان سەخت بوو، هەموویان تەواوی و چارەسەری سەرەتاییان بۆکرا و ڕەوانەکران بۆ سورەدێ، ئەوە یەکەم ڕوودا و یەکەم تەقە و خوێنڕشتن بوو لە بەرەی تازەی شەڕ کە بە داخەوە خوێنی هاوڕێکانی خۆمان بوو و خەمی زۆرمان لێخواردن، بەهۆی ئەو ڕووداوەوە ئەو کەرەتە هەموویان کە چەند



کەسێکی کەمیان مابوو ڕۆیشتنە خوارەوە و ئێمە لە شوێنەکەیاندا جێگیربووین. ئەم شاخە کە بووە بەرەیەکی شەڕی گەرم لە ڕۆئاوای گوندی سورەدێوە دەستپێدەکات و بە درێژایی پڕ لە دار و ڕقەبەردا درێژدەبێتەوە بۆ زیاتر لە پێنج کیلۆمەتر پێشمانەوە کۆمەڵێک گوند و گۆردۆڵکەیە و دووژمن لێی دامەزراوە. پشتیشمانەوە شاخێکی بەرز و سەختە کە سەرکەوتن پێیایدا مەحاڵە. تەنیا ڕێگا کە لێوەی هاتووچۆ بکەین هەر ئەو باریکە ڕێگەیەیە کە بەرەو سورەدێ دەڕوات. واتا ئەگەر ڕێگەی لای سورەدێ بیگرێ. ئەوا ڕێگەی گەڕانەوە و دەرچوونمان لێدەگیرێت. بەڵام ئەو کاتە کەس بیری لەوە نەکردبۆوە.

تیپەکانی ٣١ و ٤٧ و پارێزگاری و ٣٧ی شارباژێر لەم بەرەیەدا بوون. لێرە جارێکی تر هەردوو هاوڕێی خۆشەویستم شەهید شۆڕش و شەهید بەختیاری حەمە کوردستانی-یم بینیەوە. زۆر خۆشحاڵ بووم.

هەموو ئەو ماوەیەی لە سنوری مەڵبەندی سێ بووین دڵم هەرلای ئەم دوو هاوڕێیەم بوو. بە تایبەت شەهید بەختیار. بەو هۆیەی ئەو زۆر سەرکێش و نەترس بوو. هەمیشە لە پێشەوە و



لە شوێنە مەترسیدارەکاندا شەڕی دەکرد و خۆشی نەدەپاراست .
زۆر جار وارێکەوتووە لە کاتە پڕ لە مەترسییەکاندا بەزۆر دامنیشاندووە، یان باوەشم پێدا کردووە و دوورم خستۆتەوە. جارێکیان بۆ ماوەی کاتژمێرێک لێم زوویر بوو، ئاخر ئەو سەرکێشی دەکرد و من نەمدەهێشت. ڕۆژێک لە شاناخسێ لە کاتی بۆردمانی فڕۆکە جەنگییەکاندا، منم و شەهید بەختیار دەگەڕاینەوە بۆ کەرتەکەمان (کەرتی ٢) من خۆم هاویشتە پەنایەکەوە و خۆم شاردەوە. بەڵام ئەو لەدەرەوە ڕاوەستابوو، وەک هیچ ڕوونەدابێت. دەیگوت وەرە بۆ ئێرە با وێنەبگرین. سەرەتا ویستم نەچم.
ئەو ئینکاری کرد و چارم نەما. چووم بۆلای و دەستمان کرد بە وێنەگرتن. ئەو وێنەی منی دەگرت و منیش وێنەی ئەو. لەکاتێکدا فڕۆکە جەنگییەکان بۆردومانیان دەکرد. بە چواردەورماندا دووکەڵ و تەپوتۆز بەرزدەبۆوە و تەواو لە مەترسیداربووین. ئێستا هەندێک لەو وێنانە ماون و بەڕوونی دووکەڵ و تەپوتۆز لەچواردەور و پشتمانەوە دەبینرێ. بە داخەوە ئەو کاتە وێنەی سێڵفی نەبوو کەسیشمان لەگەڵ نەبوو وێنەمان بەیەکەوە بگرێ هەرتوانیمان وێنەی یەکتری بگرین.
ڕۆژێکی تر کە فڕۆکەکان بە بۆمبی هێشوویی بۆردومانیان دەکرد. ئێمە هەموومان بەخێرایی چوینە کونە

تەیارەکەوە. ئەو تا بۆمەمبەکان نەهاتنە ناومان نەهات. کە هات جێگە نەمابوو و هەر لەبەردەم کونە تەیارەکە خۆی مەڵاسدا. بۆمبێک هاتەخوارەوە و ڕێک لە پشتییەوە دای لە زەوی و خۆشبەختانە نەتەقییەوە. جارێکی تر لەکاتی تەقە و بۆمبارانندا چووبووە سەر دارێک سەیری دووری ئەکرد. هەموو هاواریان ئەکرد بەختیار وەرەخوارەوە. هاوڕێیەکی لێی نزیکبۆوە و پێی گوت کە بێتەخوارەوە. ئەو هەر نەهاتەخوارەوە. ئەم لە خوارەوە برینداربوو. ئەو بەسەلامەتی هاتەخوارەوە.

ئەوەندە سەرکێش و نەترس بوو گاڵتەی بە دووژمن و شەڕ و شەهیدبوون دەهات. ئەو کاتە هەموو پێشمەرگە وێنەیان ئەگرت بۆ دوای شەهیدبوون. تا بۆیان بکرێت بە پۆستەر کە ئەو سەردەمانە باوی بوو. یان لای هاوڕێیانیان بمێنێتەوە بۆ یادگاری.

شەهید بەختیار چەند وێنەیەکی گرت کە زۆربەیان خۆم گرتوومن. بۆ ئەوەی وەک یادگاری یان بۆ پۆستەری شەهیدبوون. ئێستا ئەو وێنانە هەمووی لە ئەلبومەکەمدان و یادگارییەکی زۆر بەرخ و نەمرن. سەدان جار فرمێسکیان لە چاوم بە تاو هێناوەتەخوارەوە.

هەڵسوکەوتەکانی، پێکەنینەکانی، توڕەبوونەکانی، و نوکتە و قسەخۆشەکانی هەمیشە لە ناخمدا لێدەدرێنەوە و بیرم ناچنەوە. ئێمە ڕۆژ تا ئێوارە پێکەوەبوین شەویش لە نزیک یەکەوە دەخەوتین. هەمیشە قسەمان دەکرد و پێدەکەنین قسەوباسمان تەواونەدەبوون.

دەیان هۆنراوەی ئەدەبی بەرگری لەبەربوو. ڕۆژانە بۆی دەخوێندمەوە. ئەو ڕۆژەی شەهید شۆڕشی هاوڕێمان بوو بە فەرماندەی دەستە. ئێمە بەخۆشحاڵییەکی زۆرەوە بڕیارماندا چالاکییەکی باش بکەین بۆ ئەوەی بۆ کاک شۆڕش سەرکەوتنێکی باش بێت و بەناوی پێدەربکات. بە تایبەت شەهید بەختیار.

زۆر لە هەوڵی ئەوەدابوو. بەڵام بەدڵی ئێمە بەو زوانە هیچ ڕووینەدا.

ئەم تیپانە کە ئێستا لێرە لە زنجیرەیەک سەنگەری دوور و درێژدا سەنگەریان لە سوپای دووژمن گرتووە. تیپەکانی شاربازێڕی سەخت و شاربازێڕی تەختن. لە ساڵانی پێش ئەنفالدا هەر تیپێک سنووری خۆی هەبوو. لەو سنوورانەوە چالاکی





خۆیان ئەنجام دەدا زەبری گورچکبڕییان لە دووژمن دەوەشاند. پێشمەرگە و فەرماندەی زۆر لەم تیپانە هەڵکەوتوون و دووژمن لێیان ترساوە. لەم تیپانەدا پێشمەرگە و فەرماندەی وا شەهیدبوون کە هەرگیز ناتوانرێ باس لە ئازایەتی و جوامێرییان بکرێ مێژوویەکە بە چەندین کتێب تەواو نابێ. ئەو تیپانە وا ئێستا هەموویان لەم سنورە بەرتەسکە بەیەکەوە بەرامبەر دووژمن وەستاون.

هەموو یەکترمان ئەناسی و هاورێ بووین. لە کاتی پێویستییدا بەهانای یەکترەوە چووین و هاوکاریی یەکترمان کردووە. لێرەش رۆژانە سەردانی یەکترمان ئەکرد و قسە و باسی هاورێیانەمان ئەکرد. بۆ من تیپی ٣٧ی شاربازێر وەک ماڵە باوان وابوو. لە ١/١/ ١٩٨٧ بە کەرتەوە گواسترایینەوە بۆ ئەم تیپە و هاورێیەتیم لەگەڵ فەرماندە و پێشمەرگەکانی دەستپێکرد. لە ئەرک و رووداوەکاندا بەشداربووم. بۆیە هەر زوو چووم بۆلایان و بە هاورێیانم شادبوومەوە. بە تایبەت هەردوو هاورێم شەهید بەختیار و شەهید شۆڕش. شەهید شۆڕش کەسێکی بەرێز و کەسێکی بەرز و رووخۆش و مەنگ بوو. کادر و فەرماندەیەکی باش بوو. ئاستی



ڕۆشـنبیریی بـەرز بـوو. مـن زۆر سـودم لـە بیرکردنـەوە و ڕۆشـنبیری ئـەو وەرگـرت. کاتێـک کەرتەکەمـان لـە مانگـی دووی ١٩٨٧ هەڵوەشـایەوە کـە چوومـە کەرتی دوو. ئـەو کاتـە شـەهید شـۆرش لەگـەڵ کۆمەڵێـک لـە هاوڕێیانـی تیـپ لـە جەولـە بـوو. بەختیـار ئەوەنـدە باسـی ک شـۆڕش و هاوڕێیانـی تـری بۆکـردبـووم. لـە دوورەوە زۆربەیانـم ئەناسـی. کـە هاتنـەوە هەموویانـی پێناسـاندم. بـەڵام کاک شۆڕشـی جیـاواز لـەوان پێناسـاندم. وەک بڵێیـت ئـەو تایبـەت بێـت منیـش ئەمـلاولام مـاچ کـرد. لـەو ڕۆژەوە بوویـن بـە هـاوڕێ. هاوڕێیەکـی شـەو و ڕۆژی و گیانـی بـە گیانـی. ئیتـر مـن و بەختیـار و شـۆڕش هەمیشـە بەیەکـەوە بوویـن. بیروڕامـان لـە یەکـەوە نزیـک بـوو.

لەگـەڵ ئـەوەی بـەردەوام شـەڕ و دوورە تەقـەی بەرامبـەر هەبـوو. ڕۆژ بـە ڕۆژ دووژمـن سـوپای زیاتـری لـەو سـنوورە کۆدەکـردەوە. تۆپخانـە و دەبابـەی زیاتـری دەهێنـا و شـەڕ نزیکتردەبـۆوە. بـەرەی شـەڕی ئێمـە لـە شـاخی کونەکۆتـرەوە هەتـا شـاخی ساوێن زنجیـرە شـاخێکی سـەخت و چـڕ و بـەرداوی بـوو. دیـوی پشتیشـمانەوە ئێرانـە و دووژمـن ناتوانـێ گەمـارۆی تەواومـان بـدات. بـەڵام ژمـارەی هێـز و کـەرەسـتەی سـەربازی ئێمـە و دووژمـن بـەراورد نەدەکـرا. ئـەوان وەک کاک نەوشـیروان لـە کتێبەکەیـدا ئامـاژەی پێـداوە. زیاتـر لـە دووسـەد هـەزار سـەربازی پیـادە و فەوجەکانـی جاشـی بـۆ پرۆسـەی ئەنفـال و ئـەو شـەڕانە کۆکرابوونـەوە. دەیـان تۆپخانـە و دەبابـەی پێشـکەوتوو هێنرابـوون. ئێمـە لـەم سـەر تـا ئەوسـەری شـەڕگە ڕەنگـە پێنـج سـەد کـەس نەبووبیـن. لەگـەڵ چەنـد کاتیۆشـایەک و چەنـد هاوەنێـک و تۆپخانەکـەی شـەریفی قورعانـی و دۆشـکا و بیکەسـی و ئـارپـی جـی چەکـی قورسـی ئێمـە بـوون. بـەڵام بڕوایەکـی گەورەمـان بـە بەرگـری و خۆڕاگـری هەبـوو. ئـەو هێـزە زۆرەی دووژمـن هیـچ نەیدەترسـاندین. ئـەوان چـۆن خۆیـان ئامادەئەکـرد بـۆ هێرشـێکی سەرتاسـەری. ئێمـەش خۆمـان ئامادەئەکـرد بـۆ بەرگرییەکـی گـەورە.

دکتۆر فایەق گوڵپی

# دەزگای تەندروستی پیشمەرگە یان نەخوشخانەکانی شورش

سازدانی: ئیسماعیل خالید

هەر لەسەرەتای هەڵگیرساندنەوەی شۆڕشی نوێی گەلەکەمان بەڕابەرایەتی (ی.ن.ک) کەشۆڕشێکی جەماوەری بوو، هەموو چین و توێژێک بۆ سەرخستنی ئەو شۆڕشە پاڵپشت و پشتیوان بوون ئەو توێژەی کەلێرەدا تیشکی دەخەینە سەر ڕۆڵێکی گرنگی هەبووە لەشۆڕشەکەماندا ئەویش تەندروستیە.

کەبەدەیان دکتۆرو کارمەندی تەندروستی لەسەردەمی شۆڕشدا بۆ پشتیوانی هێزی پێشمەرگەی کوردستان خۆبەخشانە کۆڵە پشتەکەی دەرمان و چەکی شەرەفیان کردە شان کەشان بەشانی پێشمەرگە درێژەیان بەخەباتدا.

لەوپێناوەشدا دەیان پزیشکو کارمەندی تەندروستی گیانیان بەخت کردو تائێستاش بەردەوامی بەخزمەتی پێشمەرگەو کەسوکاری شەهیدان و جەماوەر دەدەن و چەندین نەخۆشخانەمان بەناوی نەخۆشخانەکانی شۆڕشەوە هەیە بۆ ئەم مەبەستەش گۆڤارەکەمان درێژە بەچاوپێکەوتنەکانی دەدات لەگەڵ ئەو گیان بەخشانەی کە لەئێستاو ڕابردوودا خزمەتی پێشمەرگەو جەماوەریان کردوە، بەخۆشحاڵیەوە لەم ژمارەیەدا چاومان کەوت بە بەڕێز (دکتۆر فایەق گوڵپی) کەیەکێکە لەپزیشکەکانی سەردەمی شاخ و مێژوویەکی پرشنگداری لەسەرخستنی شۆڕشدا هەیە. بەم شێوەیە باسی نەخۆشخانەکانی شۆڕشی لەسەردەمی شاخدا بۆ کردین.



**پ/بەڕێز د.فائق بەڕێزتان لەساڵی چەن پەیوەندیتان بەڕێکخستن و بەڕیزەکانی هێزی پێشمەرگەوە کردوە؟**

و/ من سەرەتای ساڵی ١٩٧٦ پەیوەندیم بەڕێکخستنەکانی یەکێتی نیشتیمانی کوردستانەوە کردووە ئەو کاتە یەکەم جاربوو بەیانی دامەزراندنی یەکێتی نیشتیمانی کوردستانم وەرگرت پێم وابێت لەمانگی ٤ی ١٩٧٦دا بوو ئێمە ئەو کاتە وەکو کۆمەڵەی خوێندکاران ئیشمان دەکرد دوای ئەوەی کۆلێژی پزیشکیم تەواو کرد لە ١٩٨٢/٤/١ پەیوەندیم بەهێزی پێشمەرگەوە کرد بەکەم شوێن کە پەیوەندیم پێوە کرد چەند بارەگایەکی هێزی پێشمەرگەی کوردستان لەتیپی(١١)ی هەورامان بارەگایەکیان لەگوندی هاوار بوو منیش چووم و لەوێ پەیوەندیم کرد بە هێزی پێشمەرگەوە.

**پ/ لەشار ڕێکخستنەکانتان چۆن بوو؟**

و/ ئێمە لەکۆلێژی پزیشکی ڕێکخستنی خۆمان هەبوو دوای ئەوەی ئەو ڕێکخستنەمان چالاکی نەما دواتر ساڵەکانی ١٩٧٨ و ١٩٧٩ لەڕێگەی کەرتی ڕێکخستنی کۆمەڵەی هەڵەبجەوە

لە ساڵی هەشتاکاندا لە گوندی قوڵەهەرمێ نەخۆشخانەی شەهید د. بەختیار کرایەوە کە یەکەم نەخۆشخانەی شۆڕش بوو کە تاقیگەی تێدا بوو کە تیشکی تێدا بوو نەشتەرگەری بچووکی تێدا ئەنجام دەدرا کۆمەڵێک دکتۆر چوونەتە ئەو نەخۆشخانەیە و خزمەتیان تێدا کردووە

لەخورماڵ پەیوەندیم بەڕێکخستنی کۆمەڵەوە کرد لەڕێگەی کاک مەلا یاسینی هەڵەبجە کەپێشمەرگە بوو بە نهێنی ئەهاتە ناوشار.
جارێکیان هاتبووە خورماڵ بە ئیختیفا بۆسەردانی ڕێکخستنەکان هاتبوو خزمی خۆم بوو لەوێ بینیم ئەدەبیاتی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستانم لێ وەرگرت و خوێندمەوە دوای تەواو کردنی کۆلێژی پزیشکی لەشاری هەولێر دامەزرام لەوێ پەیوەندیم بەکەرتی ڕێکخستنی شەقلاوە وە کرد کەرتەکە پۆلی جەماوەری هەبوو ئیتر لەوێ ئابونە و دەرمانمان بۆ هێزەکان جێبەجێ دەکرد دواتر کە دەرفەتی ئەوەم بۆ ڕەخسا بچمە دەرەوە زۆر حەزم دەکرد ببم بە پێشمەرگە ڕۆژی ١٩٨٢/٤/١ چوومە هەڵەبجە و گوندی هاوار پەیوەندیم بەڕیزەکانی پێشمەرگەی یەکێتی نیشتیمانی کوردستانەوە کرد.

**پ/ ئێوە چۆن بەشداریتان لە چالاکییەکاندا دەکرد؟**

و/ بەگوێرەی شوێنەکان و کاتەکان بەشێوەیەکی گشتی ئەوانەی پزیشک بوون یان کارمەندی تەندروستی بوون زۆربەی کات لەبارەگای کەرت و تیپ و مەڵبەندەکاندا یان سەرکردایەتیدا

دەمایــەوە نەخۆشــخانەمان هەبــوو لەشــوێنەکانی خۆمــان بــە جێگیــری دەمایــەوە نەخۆشــەکان ســەردانیان دەکردیــن لەپێشــمەرگە و هاوڵاتــی ســەردانیان دەکردیــن وە ئەگــەر بێــت و شــەڕێک هەبوایــە ئێمــە مەفــرەزەی پزیشــکیمان لەگــەڵ پێشــمەرگەکاندا دەنــارد لەپشــتەوەی بــەرەی شــەڕ لەگــەڵ هەندێــک پێشــمەرگە دەمایــەوە چاوەڕوانــی بریندارەکانمــان دەکــرد چارەســەری ســەرەتایمان دەکــردن و ڕەوانــەی نەخۆشــخانەکانی خۆمانمــان دەکــردن لەســەرکردایەتی بۆنمونــە لەســاڵی ١٩٨٦ هێــزی پێشــمەرگە شــارۆچکەی ســەنگاوی گــرت مــن خــۆم وەکــو تیمــی پزیشــکی بەشــداریم کــرد لــە گونــدی کرپچنــە مامــەوە.

## پ/ ئێوە بۆ بەشداری کردن لە کار و چالاکییەکانتان فەرمانتان لەکێ وەردەگرت؟

و/ ئێمــە بەتەنسیق بەشــداریمان دەکــرد لەگەڵ بەرپرســەکان تەنســیقمان هەبوو ئەگــەر بەرنامــەی چالاکیــان هەبوایــە بەرپرســی مەڵبەنــدەکان یــان بەرپرســە ســەربازیەکان داوایــان لێدەکردیــن کــە ئێمــە تیمیــک ئامــادە بکەیــن بــۆ هاوکاریــان ئێمــەش بــە خۆشــحاڵییەوە بەشــداریمان دەکــرد.

## پ/ بنکەی سەرەکیتان کوێ بوو وەکو بنکە تەندروستییەکان؟

و/ بەپێــی قۆناغــەکان بــەر لەشــەڕی نێــوان عێــراق و ئێــران بنکــەی جێگیــر زەحمــەت بــوو بــۆ نمونــە یەکــەم مەفــرەزەی ناوچــەی هەورامــان د.ڕەزایــان لەگەڵــدا بــوو یــان د.خــدر هــەم پێشــمەرگە بــوو هــەم پزیشــک بــوو دوای ئــەوەی کــە پێشــمەرگە گەشــەی کــرد ناوچــەی ئازادکــراو هەبــوو نەخۆشــخانەی ســەرکردایەتی و مەڵبەنــدەکان دامــەزرا بــۆ نمونــە لەســاڵی هەشــتاکاندا لــە گونــدی قوڵەهەرمــێ نەخۆشــخانەی شــەهید د.بەختیــار کرایــەوە کــە یەکــەم نەخۆشــخانەی شــۆڕش بــوو کەتاقیگــەی تێــدا بــوو کــە تیشــکی تێــدا بــوو نەشــتەرگەری بچووکــی تێــدا ئەنجــام دەدرا کۆمەڵێــک دکتــۆر چوونەتــە ئــەو نەخۆشــخانەیە و خزمەتیــان تێــدا کــردووە وەکــو د. شــادومان و د. فوئــاد و خــۆم د. شــوان ئــەم قۆناغــە قۆناغــی جیاکردنــەوەی پیشــەی پزیشــکی و ئەرکەکانــی تــر بــووە پزیشــک کاری خــۆی کــردووە ڕاگەیانــدن، کۆمەڵایەتــی، دارایــی، ئیشــی خــۆی کــردووە دواتــر لەکۆتایــی ١٩٨٢ مەڵبەنــداکان دروســت بــوون

هەموو مەڵبەندەکان نەخۆشخانی تایبەت بەخۆیان هەبوو مەڵبەندی یەک د.هەژار و د. کەمالی لێ بوو. مەڵبەندی دوو من لەوێ بووم. مەڵبەندی سێ د.زریان تا لە کۆتایی ١٩٨٦ نەخۆشخانەکان زیاتر پێشکەوتن بەتایبەت نەخۆشخانەی بەرگەڵو کە عایدی سەرکردایەتی بوو د.نەوزاد ساڵح کە زۆر نەمایەوە دواتر د.ئەدیب ناسراو بە هەڵۆ دکتۆری جەڕاح بوو ئێمەش لەکاتی مفاوەزاتەکەدا دەورەمان بینی د.شوان. من. کاک ئاکۆ شەهید د.هادی وای لێهات نەخۆشخانەی بەرگەڵو ببێت بە نەخۆشخانەیەکی گرنگ لەناو شۆڕشدا نەشتەرگەری و بەنجی عامی تێدا دەکرا نەخۆشخانەی مەڵبەندی(١) سەرەتا لەگوندی سێوسێنان بوو بەهۆی بۆردومانەکانی دوژمنەوە گواستمانەوە بۆ قۆپی قەراغ لەبەینی گوندی باڵخە و بەلەکجاڕ لەساڵی ١٩٨٧ د.ناسیح و د.جەلالیش هاتن بۆلام و بوین بەتیمێکی پزیشکی کۆمەڵێک نەشتەرگەریمان ئەنجام دا د.حەسەن ئەویش ماوەیەک پێش ئەوە لەگەڵمەندا بوو. بەبێ جیاوازی چارەسەری هاوڵاتی و پێشمەرگەمان دەکرد.

من لەکاتی مفاوەزاتەکەدا هەندێک پسوڵەی نەخۆشخانەکانی سلێمانیم لەگەڵ خۆم هێنابوو. نەخۆشم ئیحالەی نەخۆشخانەکانی کە دەکرد بەو پسوڵانە لە ١٩٨٦ بەدواوە کەڕێککەوتن لەنێوان حزبە کوردستانیەکان کرابوو ئێمە بەبێ جیاوازی چارەسەری هەموو پێشمەرگەیەکمان دەکرد ئیتر هەر حزب و لایەنێک بوبێت ئەوکاتە لە سێوسێنان بووین مەفرەزەیەکی حزبی سۆشیالیست بریندارێکیان هێنا چارەسەرمان بۆکرد. ئەو هەڵوێستە کاریگەری باشی هەبوو لەسەر ڕای برادەرانی سۆشیالیست. کاک محەمەدی حاجی مەحمود لەکتێبەکەی خۆیدا هەڵوێستی نەخۆشخانەی شۆڕشی بەرز نرخاندبوو دەڵێت یەکێک لە هۆکارەکانی ڕێککەوتنمان هەڵوێستی د.فایەق و نەخۆشخانەی سێوسێنان بووە کەڕێزیان لەبریندارەکانمان گرتووە و چارەسەریان کردوون بەهەمان شێوە هەڤالانی حزبی شوعی کە هێشتا لەگەڵ یەکێتی ئاشتیان نەبووە وە بریندارێکیان هەبوو ناوی کاک تۆفیق بوو هێنایان بۆمان چارەسەر کردن. لەڕوی سیاسییەوە یەکێتی هیچ تەداخولێکی ئیش و کارەکانی ئێمەی



نەدەکرد. بەڵام ئێمە هەندێک جار شەڕمان لەگەڵ دەکردن بۆنمونە ئێمە خەڵکمان بانگ دەکرد کە هاوکاری داراییمان بکەن ئەیانوت بۆچی دەوڵەمەندەکان هاوکاری قادسیەی صەدام دەکەن هاوکاری ئێمە ناکەن دەوڵەمەندێکیان بانگ کردبوو تەمەنی هەبوو.

نەخۆشیش بوو منیش ئەمناسی خەڵکی هەڵەبجە بوو برادەران ویستیان سجنی کەن بەڵام من نەمهێڵاو لە نەخۆشخانەکە هێشتمەوە تاکو کێشەکەی چارەسەر بوو. لەو ڕووداوە مەبەستمە بڵێم هەرشتێک پەیوەندی بە نەخۆش و بە نەخۆشخانەکەوە بوو ئێمە بڕیارمان لەسەر ئەدا و بەرپرسە سەربازییەکان دەستوەردانیان نەدەکرد. وە هەروەها برادەرانی حیزبی شیوعی و پارتی کە دەهاتنە ناوچەکە . بۆچارەسەر دەهاتنە نەخۆشخانەکەی ئێمە. برادەرانی پارتی بەرپرسێکیان هەبوو بە ناوی (ئەکبەر حیدر) کە ئێستاش لە ژیاندا ماوە. نەخۆش کەوت و نزیکەی ١٠ ڕۆژێک لای ئێمە مایەوە و چارەسەرمان بۆ کرد.

دوای دەرچوونی لە نەخۆشخانەکە سوپاسنامەیەک بۆ نووسیم بۆیە ئێمە ئەتوانین بڵێین جیاوازیمان لە بەینی هیچ حیزبێکدا نەدەکرد و بێ جیاوازی چارەسەری هەموو نەخۆشێکمان دەکرد. سەرەڕای ئەوەی نەخۆشخانەکانمان لەژێر هەڕەشەی حکومەتی عێراقدا بوو بە بەردەوامی. ئەوەی کە زیاتر جێگای نیگەرانی

ئێمە بوو پزیشکەکانمان شارەزاییمان لە چارەسەری نەخۆشی بەرکەوتووانی چەکی کیمیایی نەبوو. بەڵام خۆشبەختانە سوتفەی سەربازێکی هەڵهاتووەی رژێمم کرد کە دەفتەرێکی پێبوو هەموو چارەسەر و رێکارەکانی چارەسەری بەرکەوتووانی چەکی کیمیایی تێدابوو. کە لە محازەرەدا خۆی خوێندبووی لای خۆی نووسیبووی و تۆماری کردبوو.
ناوی مەحموود بوو برای رەفیقێکی خۆمبوو . بەناوی وەهاب. توانیم لە رێگای وەهابەوە دەفتەرەکەی لێ وەر بگرم وە هەندێک لە رەفیقەکانیشمان سەردانی ئێرانیان کردبوو خولێکی چۆنییەتی چارەسەری بەرکەوتووانی چەکی کیمیاییان بینیبوو.
لە سالانی ١٩٨٨ و ١٩٨٧ توانیمان چارەسەرەکە بدۆزینەوە

## پ/ رۆژگارەکانی ژیانتان پڕن لە یادەوەری تاڵ و شیرین ئەو یادگارییانە کامانەن کە هەمیشە لە یادتان ماوە؟

و/ لەمانگی ١٩٨٢/٤ من چوومە دەرەوە لە گوندی هاوار و جێگیر بووم لە کەرتەکەی مامۆستا شاهۆ کە شەهید نیازی جێگری بوو. دوو رۆژ دوای ئەوە پێشمەرگەیەک هات بۆلام لە کەرتەکەی کاک (حەمەی حمە سعید). لە گریانە بوون.
پێشمەرگەکە ناوی ئازاد بوو وساڵێک یان زیاتر گولەیەک بەر پشتی کەوتبوو. چووبووە تارانیش چارەسەر نەکرابوو دکتۆر پێی وتبوو لە حەبلی شەوکیت نزیکە دەستکاری ناکرێ. بەلام کە سەیرم کرد گولەکە لە ژێر پێستەکە بوو. بە پێی کات لە حەبلی شەوکی دوور کەوتبووەوە چارەسەرەکەی ئاسان بوو. منیش بەنجی مەوزوعیم بۆ کرد و گولەکەم بۆ دەرهێنا. بۆ سەرەتای دەستبەکار بوونم و ئەوە شتێکی خۆش بوو.
ئەوەشی کە زۆر ناخۆش بوو ئەوەبوو لە رۆژانی پێشمەرگایەتیم هەمیشە لە یادمە لە ئەنفالی سێدا ئێمە لە گوندی کوردە میرەکان بووین لە گەرمیان ئەو ناوچەیە ئاوی زۆر کەمبوو. لە بەرواری ١٩٨٨/٤/١٤ نزیکەی ٢٠ نەخۆش و بریندارمان لابوو. یەکێک لە بریندارەکان ناوی (ئەبوو فەلاح) بوو قاچێکیمان بڕیبووەوە چەند رۆژێک لەوەو پێش.
منیش چووم بۆلای بەرپرسەکان لە گوندی مەستۆیی. دەوری دوو سەعات بە پێ دوور بوو لێمانەوە. وتم

بەرنامەتان چییە و ئێمە چی بکەین؟ وتیان بچنەوە تا خەبەرتان پێ ئەدەین کەمن گەیشتمەوە جێ بینیم کاک (عادل شکور) فەرماندەی تیپی ٥١ی گەرمیان پەیدا بوو. خۆی و شەش حەوت پێشمەرگە بوون. لێم پرسی چی بووە؟ وتی ئێمە ئینسیحابمان کردووە. وتم ئێمە چی بکەین؟ وتی ئێوە لەگەڵ بەرپرس مەڵبەند قسە بکەن. خوا عەفووی کات کاک قادر سەعاتێک پێشتر لایبووم قسەی بۆ نەکرد. وتم کاک قادر ئێمە چیی بکەین؟ وتی تۆش لەگەڵ ئەواندا وەرە.

ئەی چی لە بریندارەکان بکەم؟!

ئێمە دکۆر و کارمەندەکان تەقریبەن ١٢ کەس دەبووین. د.جەبار و د.ناصیح و د.جیهاد نازانم ئەوکات لامان بوو یان نا . هەندێک لە بریندارەکان خەڵکیان لەگەڵدا بوو. هێسترێکمان لابوو . برادەرێکمان ناوی حمەلطیف بوو ئەومان سواری هێسترەکە کرد و ئەوانەی کە مانەوە یەکێکیان وتی دکتۆر من ناتوانم بێم ئەگەر چەکێکم لا جێ بێڵن خۆم تەسلیم کەم رەنگە نەم کوژن. منیش تفەنگەکەی خۆمم پێی دا بریندارێکی تیپی ٥١ی گەرمیانم لابوو کەسی لەگەڵدا نەبوو شەلەل بوو بێ هۆشیش بوو ناوی حەمە کۆشکی بوو. ئەو سەردەمە نەمانزانی مەسیری چییە بەڵام دەڵێن ئێستا خۆشبەختانە لەژیاندا ماوە. ئەوە ناخۆشترین کات بوو بەلای منەوە کە ئەو بریندارانەمان بە ناچاری لەوێ بەجێهێشت.

ئەو سەردەمە جاشەکان هەندێکیان باش بوون یارمەتیان ئەداین ڕەنگە لەخۆیانیان گرتبێ و نەیان کوشتبێتن و بارودۆخێکی زۆر سەخت بەسەر کوردستاندا هات.

## پ/ دکتۆر دوا وتەی بەڕێزتان چییە؟

و/ دوا وتەم ئەوەیە زۆر پێویستە پێشمەرگەی هەموو حیزبەکان یەک بگرنەوە و هەندێک حیزب هەیە مێژووی زۆر گرنگە و مێژووی یەکێتی لە هەموو حیزبێکی تر موهیم ترە چونکە کاتێک یەکێتی درووست بوو کەس بە بیری نەدەهات حیزبێک دژ بەو زوڵمە زۆرە بە تەعریب و ڕاگواستن درووست بێت بەڵام حەیف ئەو مێژووە فەرامۆش کراوە.

لەناو ئەو مێژووەدا ڕێکخستنەکانی ناوشار زۆر دەوریان هەبوو. یەکەم شەهید ئەوان دایان وە دکتۆرەکان ڕۆڵی زۆر کاریگەریان هەبوو بەڵام

# شۆڕشی ئەیلول هەڤاڵ مام جەلال دروستی کردووە

بەداخەوە فەرامۆش کراون.

لەم دواییەدا لە ئەرشیفی یەکێتی دکتۆرەکان بەسەرکراونەتەوە ئەوە کارێکی باشە.

هەرچەندە من دابڕام لە یەکێتی بەڵام ئەوە مێژووی منە بەڵام بەداخەوە دکتۆرەکانی شۆڕش کە داوام لێکردن بەشداری بکەن لە بە ئەرشیف کردنی خەبات و مێژووی خۆیان نەیان کرد چونکە عاجز کراون.

چونکە لەو سەردەمەدا ئەوەندە کاری گرنگ ئەنجام دراوە دەبوو زۆر ئیبراز بکرانایە لە نموونەی دکتۆر بەختیار کە بەرپرسی ڕێکخستنەکانی یەکێتی بوو لە زانکۆی موصل کە ڕێکخستنەکانی موصل زۆر بەقوەت بوون زۆربەی ئەو دکتۆرانەی کە بووین بە پێشمەرگە دەرچووی زانکۆی موصل بووین. (د.بەختیار ، د.مەجید ، د.شوانە ، د.زریان و من) ژمارەیەکی کەم لە زانکۆکانی ترەوە هاتبوون.

دکتۆر بەختیار بووە پێشمەرگە و هاتەوە بۆ سزادانی پیاوانی ڕژێم لەناو سلێمانی شەهید بوو تا بۆ نموونە تەیارە هاتە سەر مەڵبەندی سێ. کاک کۆسرەت شەڕی لەگەڵ دەکرد. بەسەختی بریندار بوو. دکتۆر زریان توانی لە مردن ڕزگاری بکات و چارەسەری بۆ کرد. لەسەر ئەو قارەمانییەتی دکتۆرەکان و پێشمەرگە فیلمێک بەرهەم دەهات.

ئەو هەموو تێکۆشانە بەرامبەر بە ڕژێمی ئەو سەردەمە کە ئێستا خەڵک خۆشی ئەوێ چونکە هیچ خراپەیەکی ئەو ڕژێمە باس ناکرێ. ئەوترا خەڵک برسی نەکردووە خۆ ڕاستە خەڵکی برسی نەکردووە بەڵام هیچ ئازادیەک نەبوو لەناو بردنی کورد هەبوو بەڵام ئێمە نەمانتوانی ئەو مێژووەی خۆمان بە جوانی بگێڕینەوە بۆ نەوەکانی

داهاتوو. من لە ئەنفال و کیمیا باراندا زۆر دەورم هەبوو چەند جار داوام کرد بەرنامەم لەگەڵ درووست بکەن. نەیان دەکرد لەبەر ئەوەی رەخنەم هەبوو لە یەکێتی دوورکەوتمەوە. هیوادارم یەکێتی لەبەر ئەوەی مێژووی هەیە قوربانی زۆری داوە یەکێتی پایەی هەیە. ئەگەر پایەکانی خۆی رێکخاتەوە ئەتوانێ ببێ بە حیزبێکی مەدەنی باش لەسەر مەسەلە سیاسی و دیموکراسی و نەتەوەییەکان.

لە چوارچێوەیەکی یاساییدا ململانەی حیزبییەکانی کە بکات کە لە بەرژەوەندی گەلی کورد بێت.

شۆرشی ئەیلول مەکتتەبی سیاسی لە بەغداد بوو مەلا مصطفی چۆتە بارزان پارتی ئازاد بووە جینۆسایدی گەلی کورد کراوە لەوکاتانەدا جوڵانەوەیەکی شۆڤێنی بە بەعسی کردن و تەعریب کردن نەبووە ئاشبەتاڵی حەفتاو شەش نەبووە. شۆرشی ئەیلول هەڤاڵ مام جەلال درووستی کردووە کە باسی شۆرشی ئەیلول دەکرێ گەنجەکانی ناو یەکێتی بە حەساسیەتەوە وەری دەگرن. بەس غەڵەتە.

مەکتەبی سیاسی پارتی هەڤاڵ مام جەلال دەنێرێتەوە بۆ کوردستان تا بزانن بارودۆخی کوردستان چۆنە. مەلا مستەفا لە بارزان دەبێت و هەڤاڵ مام جەلال دێتەوە بۆ شارەزوور بۆ سلێمانی کۆبوونەوەیەک رێکدەخات لەگەڵ سەرۆک عەشرەتەکان. نامەیەک دەنێرێ بۆ مەکتەبی سیاسی و دەڵێت زەمینەی کوردستان لەبارە بۆ شۆرش. ئەو کوردستان یان نەمانەی شیعاری شۆرشی ئەیلولە وتەی هەڤاڵ مام جەلالە لە کتێبەکەی صلاح رەشید باس کراوە و لە کتێبەکەی کاک مەسعود خۆیدا هاتووە کە ئەڵێ ئێمە هەڵەمان کرد شۆرشی ئەیلولمان هەڵگیرسان ئەڵێ لەوەوبەر ئەوەی عبدالكريم قاسم لەگەڵ ئێمەدا باش بووە ئێمەی بارزانی ئازاد کرد و مافی بە کورد دابوو.

بۆیە ئەڵێم مێژوو کە یەکێتی فەرامۆشی کردووە لە هەموو شتێک گرنگ ترە بەداخەوە شتە باشەکانی خۆی فەرامۆش کردووە و باوەشی بۆ ئەوانە کردەوە کە ئێمە پێمان ناخۆش بوو. ئیتر هیوای سەرکەوتنتان بۆ ئەخوازم.

# کرێکارانی مەعریفە و شۆڕشی سپی

**سەلاح جەلال**

دەبێت چۆن بڕوانینە ئاست و پەیوەندی و روانین و بیرکردنەوەوبونمان؟. لەچی هێڵێکەوە بچینە ناو زەریای بیروگومان و پرسیارەوە؟ چۆن زەمەنی بێدەنگی بە دایەلۆژوکرانەوەو خۆدۆزینەوەو لێکدانەوەوگۆڕانکاری ببڕین؟. لە دەستکەوتی مادی بۆ بیرکردنەوەو بەدواداچون و کۆشش وگونجاندن و ئاڵوگۆڕو وەرگرتن و پەیوەندێتی وهاوچەرخێتی؟..تاد. مامەڵەی رۆشنبیری بەرزکردنەوەی دروشم نیە. بەڵکو پرۆژەی رۆشنبیریە. بەردەوام پێویستی بە هۆشی مێژویی و زانستی هەیە. وەک ئەوەی (یەقتین) ئاماژە دەکات بە مامەڵەکردنیان لەگەڵ مارکسیەتدا پرۆژەیەکی مەعریفیە بۆ گۆڕانی کۆمەلایەتی بەبێ هۆشی مێژویی بووە. هەرووەها پێبەخشین لەگەڵ بونیەویەتدا بەبێ هۆشی زانستی بووە. ئەمەش دەمانخاتە تۆڕی زمان و بیرو گومان و پرسیارەوە. لەچی گێژاوێکداین و لەکوێوە دەست پێبکەین؟ ئایا چۆن بڕوانینە ئامادەیی مەبەست وکردارەکانی زمان و رەوتی ئاڵوگۆڕی رەمزی و بوعدی بلاوکردنەوە بۆ ئامانجی زمانی بەکارهاتو؟ چۆن بەسەراچونەوەو گشتگیری کردنی ئاست و قوناغی بەسەراچو بخوێنینەوەو بەراورد لەگەڵ ئیستادا بکەین بۆ ئایندەو لەم سەردەمە جەنجاڵەدا چاو بکەینەوە بۆ بەرهەمهێنان و خۆگونجاندن و جیاکاری؟ لەکاتێکدا پێویستە لەگەڵ گۆڕانکاریەکاندا بگونجێین. ئەویش پەیوەندیەکان و تۆڕی زانیاریەکانە. چۆن بچینە ناو جیهانی ژمارەییەوە؟

(ئێمە دەستمان بەوەکردووە بچینە ناو جیهانی ژمارەییەوە. بەلام هەڵگری زیهنیەتی پێش ژمارەیین؟ ل)16(1)

ئەمەش پێویستی بە نوێ بونەوەو داڕشتنەوە هەیە لە نوسینەوەی کوردیدا. گەورەترین کێشەیش زمانی کرمانجی سەرو خوارووە. تائێستا دایەلۆژێکی لەسەر نەکراوە. لەیەکگرتنەوەی یان جیاکاری؟ لەراڤەو پۆلێنکاری و رێکخستنەوەو داڕشتنەوەی سەرلەنوێی زمان و ئەدەب؟ (یەقتین) ئەم چونە ناو سەردەمی ژمارەییە لە رێگەی دەقی پەیوەنیدارو بەمیتۆدکردنی پەیوەندیداری دەقی دەبینێتەوە. نوێبونەوەی نوسینەوەی عەرەبیە بۆ نوێبونەوە لە بناغەی زمان لە نەحو، صەرف، ئیملاو نیشانەکانی ژمارەیی و پاوانکردن و رێکخستنێکی پێکهاتەیی و دەلالی دەق: (ئەو پرسیارانەی دەمانبات بۆ چونە ناوئەم جۆرە گفتوگۆیەوە بۆ تازەکردنەوەی روانین و بیرکردنەوە. لەم جۆرانەیە: چۆن لە چاخەکەماندا بژین؟چۆن لەتواناماندا دەبێت ژمارەیی بیر بکەینەوە؟چۆن توانامان دەبێت ژمارەیی بنوسین؟ چۆن لە تواناماندا دەبێت بەژمارەیی بخوێنینەوە. ئایا رێگاکانی بیرکردنەوەو نوسین لە نەبونی ژمارەیی و

ناوەنــدە کارکەرەکانــەوە مێتۆدمانکــردووە. ئــەوە خۆیەتــی لەســەرمانە لــە ئامادەبونیــا کاری لەســـەر بکەینـــەوە؟ل١٧)(2).

ئەمــەش کردنــەوەی پانتاییەکــە لــە روانیــن و بیرو فــەزادا. بــۆ خوێندنــەوەی ئێســتاو خۆئامادەکــردن لـــە بەشـــداری ژمارەییـــدا. ئەرکێکـــی گرانـــەو لەســـەر رۆشـــنبیریەکی رادیکالـــی دادەمەزرێـــت. پێویســـتە بەهۆشـــی نوێـــوە. حـــەزو ئامانـــج و ئەندێشـــەی گەشـــەکردنی ئێســـتا هەڵبگیرێـــت و کەشـــێک بکرێتـــەوە بیـــری نوێـــی تیـــادا لەدایـک ببێـت. جیاوازیەکانـی خوێندنـەوەو بەراوردکردنـە لـــە بـــواری میتودلۆژیـــادا. لای (ریجیـــس دۆبریـــە). هەمـــو میدیـــاو دامـــەزراوو کەنـــاڵ و پێگـــە رۆشـــنبیریەکان دەگرێتـــەوە. بایەخدانـــی لـــە پەیوەنـــدی نێـــوان واقیـــع و ناوچەکانـــی واقیعـــدا بـــو. ناونانیشـــی بـــۆ شۆڕشـــی ئەلکترۆنیـــەکان. (زەمەنـی بیسـتراوو بینـراو)ە. چەنـد زاراوەیەکـی تریـش بەکارهاتووە(ئەدەبـی ئەلکترۆنـی و دەقـی پەیوەندیـدارو ئەدەبـی داسـەپاوو سـیبرالادب) لـە دوای هەمـو دەسـتکەوتە زانیاریەکانـی ئێسـتاوە. لای (غرامش)یـــش شـــیکردنەوەی کۆمەڵایەتـــی بـــۆ رۆشـــنبیر مرۆڤێکـــە کۆمەڵێـــک ئـــەرک بـــۆ کۆمـــەڵ بەدەســـت دەهێنێـــت وەک:

پیشـــەی نـــوێ و بێـــژەری. پیشـــەی کاری ئەکادیمـــی و شـــیکەرەوەی بـــواری کۆمبیوتـــەرو پارێـــزەری تایبەتمەنـــد بـــە بـــواری وەرزش و دام ودەزگای راگەیانـــدن و راوێـــژکاری دامەزراوەیـــی و پسـپۆڕی سیاسـی و راوێـژکاری میـری و نوسـەری بازرگانـــی تایبـــەت. بـــە گشـــتی کرێـــکاران لـــە بـــواری رۆژنامـــەی جەمـــاوەری هاوچەرخـــدا).

بـەم جۆرەیـش رۆڵـی رۆشـنبیر جیادەکاتـەوە. لـە تەقلیدیـــەوە بـــۆ رۆشـــنبیری ئەندامێتـــی. ئـــەوان وتـراوەکان دەڵێنـەوە لەنەوەیەکـەوە بۆنەوەیەکـی تـر. ئەندامیـش راسـتەوخۆ پابەنـدن بـە چینەکان یـان بـە دامـەزراوە بازرگانیەکانـەوە لـە بوارەکانی رێکخـــەری کارەکانـــی ســـەرمایەداری. لـــەلای خۆیـــەوە تەقنیـــەی پیشـەســـازی دادەهێنێـــت. هەروەهـــا تایبەتمەنـــدی لـــە ئابـــوری سیاســـی و. بەرپرســـانی دامەزراندنـــی رۆشـــنبیری نـــوێ. یـــان سیســـتەمی یاســـایی نـــوێ ... هەرکـــەس ئەمـــڕۆ لـــە هـــەر پانتاییەکـــدا کاربـــکات. پابەنـــد بێـــت بەبەرهەمهێنانـــی مەعریفـــە یـــان بڵاوبونـــەوەی هەمـــو ئەوشـــتانەی ناودەبرێـــن بـــە پیشەســـازی مەعریفـــەوە ئەوانـــەی پەیوەندیـــان بەبەرهێنانـــی مادیـــەوە هەیـــە. کارکـــەری بـــواری بەرهەمهێنانـــی مەعریفەن).(بڕوانـە صورالمپقف/ئیدواردسـعید) لای(عەلـی حەرب)یـش بەهەڵبـژاردەی رۆشـنبیری ناویـان دەبـات. خوێندنـەوەی بەرهاتویـان هەبـەو بـەر لـە هەمـو شـتێک کێشـەیان لەگـەڵ خۆیـان و فیکـری خۆیانـدا هەیـە. بەبیرەکەیـان ئێمـەو جیهـان دەگـۆڕن بـۆ زەویەکـی نـوێ:

(خوێنەرێکـە. روداو دەخوێنێتـەوەو قەیـران دەستنیشـان دەکات بـۆ وەرگێـڕان یـان بـۆ کێشـەیەکی هـزری یـان ئامرازێکـی چەمکیانـە. ل٢٧)(3).

دواتـر لەگـەڵ رۆڵـی رۆشـنبیری تەکنیکـی و کرێکارانـی مەعریفـەدا شـیکاریان دەکات. ئاماژە بـە چونـە نێـو سـەردەمی بـە جیهانـی بـون و نێوەنـدە جـۆراو جـۆرەکان دەکات. نـەک وەک ئـەوەی رۆڵـی هەڵبـژاردە نەمابێت. بەڵکـو توانای دیکـە دەخوڵقێنێـت بـۆ بونیاتنانـی سیسـتەمی نوێـی بەیەکگەیانـدن و جیاکردنـەوە. گۆڕینـەوەو شـێوازێکی نـوێ لـە نێـوان مرۆڤـدا بەرجەسـتە دەکات.

رەخنەگرتن لە رۆشنبیری دەستە بژێر و ئەندامێتی ئەوە ناگەیەنێت. بەڵکو ئەڵتەرناتیفە بریتیە لە رۆشنبیری تەکنیکی دابڕاو لە نێو بازنەی پسپۆڕیەکەی خۆیدا ل٥ 21)(4)

ئەمەش بانگەشەکردنی نوسەرانی نوێیە بۆ کێشەی نەوەی داهاتو. کارلەسەر دامەزراندنی بەهایەکی نوێ بکەن. هەڵدەستێت لەسەر پەیوەندیداری و کارلێکەر ناوەرۆکی ژمارەیی و نێوەندێتی کارلێککراوە. فەزای تۆڕو دەقی پەیوەندیدار کەشێکی مەعریفی و بونیەیەکی نوێ پێکدەهێنن. لەنێوان دەقی ئەدەبی و سەرچاوەیی زانیاری و ئەدەبی ژمارەییدا. لە رێگەی بەدەستکەوتنی زانینەکان و کارپێکردنیانەوە بەرجەستە دەبێت.

(دەقی ئەدەبی دەقی پەیوەندیدارە لەسەر پەیوەندیداری دەقی بەو پێەی رەوتێکە لە رەوتەکانی کارلێکەر ببێتە دەروازەیەک بۆ نوێبونەوەی بیری رەخنەیی عەرەبی ل37)(٥)

بەمشێوەیەش فەزای پەیوەندیەکان بە جۆرێک فراوان بووە. تەنیا نابەسترێتەوە بە رۆشنبیری هەڵبژاردەو رۆژنامەنوس و نوسەرو سیاسی. زۆر بانگەشەی کۆتایی رۆشنبیری هەڵبژاردە دەکەن. ئەمڕۆ کۆمەڵ خۆی لە پەیوەندی هاوبەشدایەو ئامادەکاری و بونی خۆی هەیە لەڕێی تۆڕی پەیوەندیەوە. بەڵکو ئێستا رۆشنبیری تەکنیکیە هەمو پانتاییەکانی داهێنانی مەعریفە دەگرێتەوە. بەتەکنۆ رۆشنبیری فەیسبوک ناو دەبرێن. ئێمەش کتوپڕ چوینەتە ناو پێشکەوتنەکانەوە. ئێستا ئەم رۆشنبیریە دەکەوێتە ناوەڕاستی جیهانەوەو جیهان بە تۆڕی پەیوەندیە زانستیەکان گرێ دەداتەوە. ئەمەش ئامادەکاری ئەو گەلانەیە لەروی زانستیەوە بالادەستن. تەکنیک کاریشیان لەدایکبوی ئەو فەزایەن. ئێمەش دەبێت سەرەتایەک بۆ هەوڵی خۆگونجاندن بەرجەستە بکەین.

(ئێمە داوامان لێکراوە لەگەڵ ئەم چەرخەدا خۆمان بگونجێین. بەلام پێشبینی چونێکی راستەقینە بۆ ئەم چەرخە ناکرێت بەبێ بەدەستهێنانی ئەم خۆگونجاندنە. ل16)(6)

چۆن خۆگونجاندن بکەین وکامەیە ئامادەکاری و پێدراوو زانین و زانیاری و زانستەکان؟ چی خوێندنەوەیەکی سەرەتاییمان هەیە بۆ هەر لقێک لە لقەکانی ژمارەیی و پەیوەندیەکان؟ رەگ و ریشاڵیان دەچێتەوە بۆ زانستەکان. لەکاتێکدا ئەمڕۆ جیهان لە تۆڕی تەکنۆلۆژیادایە. بۆتە سەردەمی چرکە. ئێمەش بەکاربەری تەکنۆلۆژیاین. ئەمەش پرسیارە لە رابردو ئێستا لە جیاوازیەکان. چی بەدواداچونێک بۆ ئەم زانستە هەیە؟ کامەیە رەنگدانەوەو جیاوازیو ململانێ میدیای سەربەخۆو داهێنەر؟ لەکاتێکدا پێویستی ئێستای کورد شۆڕشی ریشەییو جۆراوجۆرە. ئەم پۆلینکارییەش کاری کۆلیژی ئادابو ئەندازیارانی مەعریفەیە بتوانن لە بواری گشتی زانست و مەعریفەدا گونجاندن لەم بوارە پڕ بایەخەدا بکەن. لە رێی داهێنانو کۆششی نوێو ناکۆکیەوە پێشکەوتن بەدیبهێنن. نەک وەک ئەوەی لە سایەی ژمارەییدا بژین. یان فەیسبوک بکەینەوە. لەکاتێکدا ئەم پەیوەندیە جیهانیە. دەمانبەستێتەوە بە (بون)وجیهانەوە.

(ناتوانین باس لە قۆناغی ژمارەیی بکەین

لــە بەرهەمهێنانــو وەرگرتنــا بەبــێ هۆشــی ژمارەیــی. وە بیرکردنــەوەی ژمارەیــی و روانیــن و فەلســەفەی ژمارەیــی بۆشــتەکان و جیهان. بەبێ بەدەســتهێنانی ئــەوە گوتــارو گفتوگۆیەکــی فەلســەفیانەو کۆمەڵایەتی و زانیاریانەیە. هێشتا بــەوردی لێــی نەکۆڵاوینەتــەوە بــۆ دیاریکردنــی رەوتــی ئــەم هۆشــەو ئــەو بیرکردنەوەیــەو ئــەو فەلسەفەو روانینــە. ل١٧)(٧).

ئایــا ئــەو پەرەســەندنەی دەســتمان کەوتــووە راســتەقینەیە لــە بیرکردنــەوەو روانیــن و فەلســەفەوەیە؟ یــان پەرەســەندنێکی دەســتکەوتوگەیەنەرە؟ بەبــێ پۆلینــکاری و جیــاوازی لــەم قۆناغــەوە دەچێتــە ئــەو. لەکاتێکــدا پێشــبڕکێیەکی راســتەقینە نیــە مانــای جیــاوازی لــە فیکــرو روانیــن و شــێوەو ناوەڕۆکــدا بــکات. زۆربــەی پێگــەی رۆشــنبیریش پــاوان کــراون بــۆ کۆمەڵێکــی دیاریکــراو. عەقڵــو رۆحــی رۆشــنبیری هەڵبــژاردەو یاخیــش دەگمەنەو بۆتــە کۆیلــەی گروپــکاری و شــەڕی سیاســی:

(شــیکردنەوەی هــزری راســتەقینە رێگــرە لــەوەی ناونانــی لایەنێــک بــە چــاک و ئــەوی تربــە شــەرەنگێز بکرێــت. لەراســتیدا هــزری بونــی تاکلایەنــی لــە حاڵەتــی گفتوگــۆ لەســەر رۆشــنبیریەکان هەتــا ســنورێکی زۆرگومانــی تێدەکەوێــت. ل121)(8)

ئەمــەش نەبونــی پرۆژەیــە. بیرمەنــد بەهزرەکــەی گۆڕانــکاری دەکات و لــە وان و لــە حیــزب جیــا دەبێتــەوە. بەپێچەوانــەوە دەســتەیەکی رۆشــنبیر لەهەمــو بــوارو پێگەکانــدا جێگەیــان گرتــووەو بــواری داهێنانیــان بــە خۆپەرســتی و رق خنکانــدووە. داهاتــی رۆشــنبیری بــۆ کۆمەڵێکــە لەحیــزب و حکومەتــدا هاوبەشــکن.

خانەنشــینیش نایانگرێتــەوە. بونەتــە دەریــا لوشــی دەســتکەوتەکان. دەبێــت وەک ســارتەر نۆبــڵ رەفزبکــەن؟ یــان وەک باختیــن ســیبریا هەڵببژێــرن؟ تەنیــا دەبێــت ئــەوەی نــوێ رۆڵــی خــۆی دەربخــات. ئەمــەش لــە یەکگرتنــەوەی رۆشــنبیری هەڵبــژاردەو تەکنیــک کاران رۆح و دڵ و مێشــکیان بــە پاکژبونــەوەی هەڵچونەکانیــان بشــۆن و تۆڕێکــی نــوێ بکەنــەوە. شــۆڕشــی ســپی بــکات. لەگــەڵ پێویســتیەکانی نێوەنــدە نوێیەکــەو مەرجەکانیــدا بــۆ بەشــداریکردن لــە وەرگرتــن و کارکــردن و خۆگونجانــدن لــە شــۆڕشــەکانی فیکــرو زانیــن و زانیاریــەکان لــە ئێســتادا ؟.

ئەمــەو چەندیــن پرســیاروگریمانەی تــر لــە چۆنیەتــی بیرکردنــەوەو نوســین و بیرکردنــەوەی ئەدەبــی و رۆژنامەنوســی و سیاســی و هەڵبژاردنەکانــدا چــی جیاوازیــەک دەبینیــن؟ یاخــود هەرکــەس چــووە نــاو ڤەیســبوک بەتەکنیــککار دابنرێــت؟ ڤەیــس بــوک مانــای تاقــم بەســتنە بــە هێرشــکردن و جنێــو بــە داهێنــەران. یــان سیســتەمی زانیــاری و پێــدراوو بەرهەمهێنانــی مەعریفــەو داواکاری نــوێ؟ جگــە لــەوەش جیــاوازی رۆژنامەنوســی تەقلیــدی و کاری تەکنیکــی زۆرە. لێــرە هەتــا دواســنور فــراوان دەبێتــەوە:

(ئایا پێویســتە لەســەر نوســینی رۆژنامەنوســی لــە فــەزای تۆڕەکانــدا. بــۆ نمونــە. پەیوەســت بیت بــەو رەوتــەی لــە پێش نوســینی ژمارەییدا زاڵبووە؟یان لەســەری پێویســتە بەرزبێتــەوە بۆ داواکاریــە نوێیــەکان. بــۆ ئەوگفتوگۆیانــەی لەلای ئێمــە لەســەر دەوڵــەت و هەڵبژاردنــی ژمارەیــی دەخرێنــە رو. ئایــا مەشــقی هەڵبژاردنــەکان

دەکەین؟ ل١٧(٩)

ئەمەش ئەرکی رۆژنامەنوس دەگۆڕێت. تەکنیک کاران لە ژێر دەسەڵاتی سەرمایەداری لیبرالیدا کاردەکەن. بەمەش جیاوازی دروست دەبێت. لێرەشدا لای (یەقتین)کاری ئەدەبی لەسیانیەوە دەگوێزرێتەوە بۆ چواری لە(نوسەر، دەق، خوێنەر)ەوە بە بەشداری کۆمپیوتەر. لایەنێکی بنەڕەتیە لە کرداری بەرهەمهێنان و وەرگردا.

(ناوەندێتی ژمارەیی ناوەندێکی ئاراستە کراوە. لەسەر کرداری وەرگرتنی دەقی زیاتر لە بەرهەمەکەی دادەمەزرێنێت. رۆڵی نوسەر بە پێچەوانەی وێناکراوەویە. زیاترلە خۆی ئاڵۆزترو تێکەڵاوتربووە. ل ١٩٩/١٩٨(10).

ئاماژە بەگۆڕانی گوتەی مەرگی نوسەر دەکات لە نێوەندێتی ئەدەبی ژمارەییدا. پێشتر تێگەیشتنێکی هەڵەی بۆکرابو. وەک گوتەی خوێندنەوەو خوێنەر زیاتر دەلالەتی ئاشکراو قوڵیان وەرگرتووە. ئەمە ئەوە ناگەیەنێت رۆڵی نوسەر لاببات. راستە ئەرکی نوسەر گۆڕاوە لەو جیاوازییەوە. لەئەدەبی نوسراوو ژمارەییەوە دروست دەبێت. مانای ئەرکی نوسینی ئەدەبی و فیکرو داهێنان بێبایەخ نیە. بەڵکو فراوانتر دەبێتەوە بۆ ئەوەی لە کونی دەرزیەکەوە بۆ جیهان پەخش بێت. جیاوازیش ئەوەیە ئەوانەی بەکارەری ژمارەیی خوازراوەن بەبێ پاشخان و هۆشی زانستی و گونجاندن. ئەرکی راستەقینەیان داواکردنی سەربەستی تاکو دەسەڵاتی لامەرکەزی و ئابوری تێکەڵاوو فرە سیاسیە. ئەمانەش بناغەو پاشخانی پێشوەختەیان دەوێت. ئایا ئێمە تەکنۆلۆژیامان نیە نابینە کۆمەڵگەیەکی پیشەسازی و زانستی کشتوکاڵیشمان نیە نابینە کۆمەڵگەیەکی کشتوکاڵی. بە هۆی نەبوونی زانستەکان و فەلسەفەیشەوە دوورین لەوەی گەیشتبینە زەمەنی سفر. ئەمەش بەو مانایەی دەشێت پرسیار بکەین. بۆچی بەو شێوەیە دواکەوتوین؟ کە ئەنجامی بەشداری نەکردنە لە شۆڕشە باڵاکانی جیهان. وەک (فەیسەل دوراج )ئاماژەی پێدەکات. بەشداری شۆڕشی پیشەسازی و بۆرژوازی و شۆڕشە باڵاکانی جیهان وگۆڕانە فیکری و رۆشنبیریەکانیان نەکردووە بەمەش عەرەب بەکەم ئەندام دەزانێت.

جاران پرسیارمان لەسەر قۆناغی چینایەتی و شۆڕش و جیابونەوە. هۆکاری گرنگی یەکنەگرتنەوەو پچڕان بە هۆی نەبونی بازاڕی ئابوری هاوبەش و رێکنەخستنەوە ژێرخانی ئابوری دانەمەزراوە. بەم هۆیەش سەرخانێکی پتەومان نیە. بتوانرێت گۆڕانەکانی لەسەر بکرێت..بەو هۆیەی کوردستان بەهۆی نەبونی دەسەڵاتێکی سەربەخۆوە. هەتا ئێستا بازاڕێکی هاوبەشی نیەو نەیتوانیوە سیستەمی ئابوری دابڕێژێت. ئێستاش ئابوری بەکۆمپیوتەرکردن و بەزانست کردنە. ئەرکێکی قورسە. وەک زانست و بازاڕ لەبواری ئابوریەوە زەلیلین. ئیتر چۆن و لە کوێوە پرسیار لەسەر سەرخانی کۆمەڵگا بکەین؟ پێویستە کارکردنێکی ورد بکرێت لەسەر سیستەمی ئابوری جیهانی گونجاندن بکرێت. وەک (عەلی حەرب)لە دیکارت دەڕوانم(من بیر دەکەمەوە کەواتە من هەم)ئەمەی بۆ ئەوروپاییەک نەگوتووە

بەڵکو کەشێکی بۆ بیرکردۆتەوە، بۆیە بیری بیرياری هەمو نەتەوەيەک پابەندە بە منیشەوە، ئەمەش دیسانەوە بەکاری داهێنەرانە دەکرێت، کە ریشەکانی زانست و فەلسەفە بەهۆشی زانستی و مێژوییەوە لەناو پانتاییەکانماندا دابمەزرێنین، ئەمەش کاری لقەکانی زانکۆو کەسەکانی فیکرو داهێنانە. خوێندنەوەی بەرهەمهێن بکەن، خۆ عەرەب و فارس و تورکیش لە روی مەعریفەی زانستی فەلسەفەوە وەک ئێمەن، لە کەلتورو خوێندنەوەو هۆشی خۆگونجاندن و کارکردنەوە جیاوازیان هەیە. ئەو هێڵەیشی ئێمە لە رابردو جیادەکاتەوە؟ بەرامبەر بەخستنە سەرو جیاوازی و پێدراوەکان لە هۆشی مێژویی و زانستیدا پرسیارە لە فەزای رۆشنبیری: چی کەشێک بۆ فیکرو روانینە جیاوازەکان دروست بووە؟ چی خوێندنەوەیەک بۆ مەعریفە باوو خوازراوەکان کراوە؟ یاخود رەوڕەوەی ئۆپزسیۆنی حیزبی چیە؟. ئەویش هەمان تراژیدیا دوبارە دەکاتەوە، پێویستە کاری رێکخراوەیی مەدەنی بکات و سیستەمێک دابرێژێت. خەڵکە گشتیەکەش لەگەڵ پێدراوو دەستکەوت و ئامانج و بەرهەمهاتووەکاندا یەکسان بکاتەوە. دامەزراندنی تۆڕی پەیوەندیە بەچینی رۆشنبیری نوێوە لەسەر ئاستی بەرهەمهێنان و گۆڕانکاری راستەقینە، ئەرکی شۆڕشی سێیە، کارکردنە لە تۆڕی پەیوەندیەکانەوە، تەکنیکی و جەماوەری، کارکردن لەبواری بەرهەمهێنانی مەعریفە. سیستەمی دیموکراسی ئەو رۆڵەی جارانی نەما لە بەردەم فەزای ژمارەییدا، لەبەر ئەوەی لێرە پێویستی بە ئامادە بون هەیە، هەمیشە

من و تۆو ئەوان ئامادەین روبەڕوی یەکتری دەبینەوە، ئەمە سیستەمێکی نوێی لە گۆڕانکاریەکاندا هێنایە کایە، رۆڵی کرێکارانی مەعریفەی کردە جاڵجاڵۆکەی تەونەکانی بون، لێرە هەزاران ئامادەن، لە یەک کاتدا هەمومان سیستەمێک دادەهێنین، ئەمانەش لەو کارکردنانەوە دەدۆزرێنەوە دەمانباتەوە بۆ ناو فەزای رۆشنبیری، چۆن شێوازی ئاستێک لە ئاستێکی تر جیادەکرێتەوە، لەپچڕانی شیرازەی نەتەوەیی و چینایەتی رۆشنبیر ئێستا بۆتە چینێکی جێگرەوەو باڵادەست، هەتا بەرز بونەوەی ئاست و جیابونەوە لە پێشوو بە مانای شۆڕش لە هەمو بوارەکاندا خاوەنی جیابونەوەیەکی مێتۆدی و فیکری نیە. پێویستە بە بەرهەمە فیکریەکان جیابکرێنەوە، لێرەدا لە زانکۆکانەوە ئەو تۆڕە بکەینەوە، ئاسۆی دەرچوانی زانکۆ تا چەندە لە پانتایی و هێڵە جیاوازەکاندا کاریان کردووە؟ کامەیە بەکۆمپیوتەرکردنی ئابوریەکان و بە ژمارەکردنی نوسراوەکانی ئەدەبی و هونەری و رۆشنبیری، یاخود ئەو ریشەو خوێندنەوانەی لەبواری زانستەکان و فەلسەفدا کرابێت؟ ئەی کەواتە کامەیە هۆشی مێژویی و مەعریفی؟ چۆن بچینە ژمارەییەوە؟، لەکاتێکدا ئامارو رێکخستنی ژمارەیی کاری کۆلیژی ئادابە، چۆن بیرکردنەوەو روانین و خوێندنەوەمان بەژمارەیی بکەین؟ چۆن دەقەکانی ئەدەبی کوردی بەژمارەیی دەکرێن؟ ئەدەب لە سەدەی ژمارەییدا دەبێتە دوان، ئەوەی کۆن نوسراوەو ئەوی تر ژمارەیی نوێیە.(سەعید یەقتین) راڤەی هەمونەو دەقانەی کەلتوری عەرەبی دەکات، ئەوانەی

دەست خەتن لێکۆڵینەوەیان دەوێت جگە لە قورئانی پیرۆز، هەمو مەرجەکانی تیایە بچێتە ژمارەییەوە. ئەمەش لە چوار بەشدا شیدەکاتەوە.

(ا. وشە)لە وردبینی وێنەی وشەکان(ئیملا) و دانانی خاڵ لەسەر پیتەکان. خاڵبەندی. پەنابردن بۆ شێوەی شیتەڵکردنەوە. (ب. رستە)وەستان. دانانی نیشانە لەنێوان ئایەتەکان (ج.گوتار). دیاری کردنی نیشانە لەنێوان سورەتەکاندا. دیاریکردنی ئایەتەکان (د. دەق) رێکخستنی ئایەتەکان و جیاکردنەوەیان بۆ ئەحزاب و بەشەکان. ئەمانەش کرداری بیناکردنن لەبەر ئەوەی کاردەکەن بۆ گواستنەوەی دەق لە تەلارسازی شەفەویەوە بۆ کرداری نوسراوەیی.(بروانە/ النص المترابگ/ ل114=ه11

ئەم ئامادەکاریەی ئێستا بۆ ئایندە پێویستی بە راڤەی تەواو هەیە. کاری زانکۆو کەسەکانی فیکرە. دەبێت چۆن باس لە ژمارەیی بکەین؟ لە کاتێکدا بەرهەمهێنانی مەعریفە کارکردنە لەسەر پێدراوو پێگەیشتو نامەو کارەکانی ناو پانتاییەکانی مێژویی و زانستی بە شێوەیەکی گشتگیر. ئەی کەواتە چۆن لە رابردو جیادەبینەوە؟ دابەلۆژمان لەگەڵ ئەوەی ئایندەدا چیە؟ ئەی نامەکانی ماستەرو دکتۆرا؟ ئەمە جێگەی هیچ مشتومڕێک نیە. دەبو ببونایە بە خاڵی وەرچەرخان و خستنە سەرو جیاکاری گەورە. مانای چیە نامەکان بڵاونابنەوە؟ دەکرێت خوێندنی باڵا، وەک هەنگاوی باشی ناوە کەشێکی پێشبڕکێ بۆ ئەوانە بکاتەوە. بڕوانامەیان نیەو توێژینەوەی بەربڵاویان هەیەو دەتوانن لەپانتاییەکدا جیاوازیەک بخوڵقێنن. لە کاتێکدا بۆشاییەکانمان ئەوەندە زۆرن لە ئاستی زانستەکان و فەلسەفەوە نەگەیشتوینەتە زەمەنی سفر. کەواتە چۆن بەرەو ژمارەیی بچین؟ ؟ئەمەو دەیەها پرسیاری تر لە تۆڕێکدا پیشان دەدات تەنیا پێویستە بگەڕێینەوە بۆ خاڵی سەرەتا.

ئێستا بەهۆی جیهانگیری و پەیوەندیەکانەوە کرانەوەیەکی گەورە هەیەو ئەو داخراویەی پەیوەندیەکان نەماوە. بەهۆی باری جوگرافی و دوری لە دەریاو رۆژ هەڵاتی ناوەراست و سەختی ناوچەو هاتوچۆوە هەبووە. ئەوەی کاریگەری راستەوخۆی هەیە پارچە بونی کوردستان و پچڕانی شیرازەی نەتەوەیی و چینایەتیە پێویستە لەروی عەقڵ و مەعریفەوە هەوڵی یەکگرتن بدرێت. ئەمەش گۆڕنکاری فراوانی دەوێت لە هەمو پێگەکانی ئێمەدا. لای (سەعید یەقتین) بایەخدانە بەزانست. ئەگەری سەرنەکەوتن دەگێڕێتەوە بۆ ئەوەی خەو بەگۆڕانکاریەوە دەبینین ولە بەدەستهێنانی گۆڕانیشدا بایەخ بەزانست نادەن. لەم رووەیشەوە بانگەشەی چەکداریون دەکات بەدو شت: (مەعریفەی زانستی و تەکنۆلۆژیا. ئەو هاوبەشیە مەرجکراوەی لەنێوانیاندایە: ئەوە: (زانستێکی دامەزراوە لەسەر بناغەی مەعریفی و فەلسەفی. هەرچەندە رۆشنبیرانمان زیادەڕەوی بەزانستێک دەکەن پانتایی مرۆڤایەتی هەڵگرتووە. )ل13 (11)

یەقتین باس لەوە دەکات پەیوەندیان بەتەکنۆلۆژیای راگەیاندن و پیگەیشتنەوە لە رێگەی وەرگرتنەوە بووە. ئەم نوێبونەوەیەی

نوسینی عەرەبی بۆ ژمارەیی، بە نوێبونەوەی زمانی پێگەیشتن دەزانێت لە نێوانیاندا. ئایا دەبێت چۆن زمانی پێگەیشتن بەرجەستە بکەین و کار بۆ پێدراوو خستنە سەرو جیاوازی و بەرهەمهێنان بکەین؟ بۆ یەکگرتنی عەقڵ و گونجاندنی زانستی ژمارەیی... تاد.

ئەمانەو دەیەها پرسیاروگریمانەی ترلەو پێشکەوتنە رێژەییەی پەیوەندی بەتەکنۆلۆژیاو پێکگەیشتن و وەرگرو شۆڕشی سپیەوە هەیە دەمانخاتە بەردەم شەپۆلی پرسیارو گومانی سەرسوڕهێنەر.

سەرچاوە:


-1 النص المترابط ومستقبل الثقافه العربيه/سعيد يقطين/المركز الثقافي العربي/الطبعه الاولى2008 بيروت لبنان/ص16.

-2 النص المترابط/سعيد يقطين/ نفس المصدر/ ص1٧

-3الممنوع و الممتنع/ نقد الذات المفكره/ على حرب/ المركز الثقافي العربي/ الطبعه الاولى/ص2٧

-4 باسی کۆتاییەکان -کردنەوەکانی بە جیهانی بون و تەڵزگەکانی شوناسنامە/عەلی حەرب وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە سەلاح حەسەن پاڵەوان. لە بلاوکراوەکانی ئاراس چاپی یەکەم 2006/لا٥21

٥- النص المترابط/ سعيد يقطين/ نفس المصدر/ص 3٧

-6نفس المصدر/ ص16

٧-نفس المصدر/ص 1٧

-8صور المثقف/ادوارد سعيد/نقله الى العربيه غسان غصن/١٩٩٦ دار النهار بيروت

٩- النص المترابط/ سعيد يقطين/ نفس المصدر/ص1٧

-10 النص المترابط/ سعيد يقطين/ نفس المصدر ص198/١٩٩

-11 النص المترابط/ سعيد يقطين/ نفس المصدر ل13


تێبینی: دوا وتارو لێکۆڵینەوەمە بەکوردی تاماوەیەکی درێژ.

لە رۆژنامەی چاودێر ژمارە(24٧)لە 14/11/2011دا بڵاوبۆتەوە.




گۆران زیاد شێخانی

مامۆستای بەشی ڕاگەیاندن - پەیمانگا


# میدیتەیشنەکانی دیکارت

## هەڵهێنجانی چەمکی مەعریفەی خودا و خودناسی




لەساڵی 1928 رێنی دیکارت دەستی کرد بە کارکردن لەسەر ئەو نامە تەواو نەکراوانەی کە دوای مردنی خۆی بڵاوکرایەوە کە بریتی بوو لە چەند دەقێکی گونجاو بۆ بیرکردنەوەی زانستی و فەلسەفی بەناوی regulated directional in genii کە مەبەست لێی رێساکانی ئاراستەکردنی دەروون بوو بەشێوەیەکی گشتی ئەم نوسراوە لە 36 بنەمای گشتی پێک هاتووە، کە هەریەکەیان وەک رەهەندێکی گرنگ بۆشیکاری دەروونی سەیردەکرێن بۆنموونە لەیاساکانی 1_12 باس لەپێناسەی زانست و ئۆپراسیۆنە سەرەکیەکانی میتۆدی زانستی ( ئینتێزیۆن و لێبرین و ژماردن) دەکات کە بەمانای هێز یان توانای بەدەستهێنانی زانیاری بەبێ ناسین یان بیرکردنەوە و دەرئەنجامی عەقڵانی ئاشکرا دێت ، هەروەها لەیاساکانی 13_24 باس لەوە دەکات کە کێشە چیە و هەموو ئەو بنەمایانەی کە کێشە چارەسەر دەکەن چین کە بەچەند رێسایەکی بیرکاری ئەو مەرجانەی کە پەیوەندیان بە چارەسەر کردنەوە هەیە دەخاتە روو هەروەها لە یاساکانی 25_36 باس لە

زنجیرە نامەکانی سۆزەکانی ڕۆح کە بریتیە لە نەریتێکی دوور و درێژی لێکۆڵینەوەی فەلسەفی لە سروشتی سۆزەکان ، خولیاکان ، ئەزموونەکان ئێستا بەشێوەکی باو لە سەردەمی مۆدێرنەدا پێیان دەوترێت (سۆز) کە لە سەردەمی ئەفلاتونەوە بابەتی مشتومڕی فەیلەسوف و زانایانی ئاینی بووە

کێشەی تێگەیشتنە ناتەواوەکان دەکات ، ئەو کێشانەی کە یەکێک یان چەند مەرجێکی پەیوەندیدار بە چارەسەر کردنی کێشەکان نازاندرێت ، بەلاَم مەرجە بدۆزرێتەوە ئەو کێشانەش زیاتر لە بابەتەکانی فەلسەفەی سروشتی و میتافیزیکدا سەرهەڵدەدەن .
یەکێک لە کتێبە گرنگەکانی تری دیکارت بریتیەلە بنەماکانی فەلسەفە (principia philosophies) لەم کتێبەدا دیکارت بنەماکانی سروشت دەخاتە ڕوو لەپاڵ یاساکانی فیزیا کە گرنگترینیان بریتیە لەو بنەمایەی کە لە غیابی هێزی دەرەکیدا جوڵەی تەنێک یەکسان دەبێت بەهێڵێکی راست وەک دەوترێت (نیوتن) ئەم بنەمایەی لە دیکارت وەرگرتووە هەر لەبەر ئەوەیەکەتاکوو ئەمرۆ ئەم بنەمایە بە یاسای یەکەمی جوڵەی نوتن دادەندرێت ، کتێبەکە بە پلەی یەکەم مەبەست لێی جێگرتنەوەی مەنهەجی ئەرستۆ بوو لە زانکۆکانی فەرەنسا و بەریتانیا کە بریتی بوو لە سیستماتیکی میتافیزیک و فەلسەفەی سروشتی و نوێنەرایەتی یەکەم گێرانەوەی میکانیکی گەردوون دەکات یەکێک لە کتێبەکانی تری دیکارت بریتیەلە Discourse on the

**Method** ئـەم کتێبـە بۆیەکەمجـار لـە وڵاتـی هۆڵەنـدا چاپکـراوە و بەگشـتی لەگـەڵ تێڕامانـەکان لەسـەر فەلسـەفەی یەکـەم دواتـر بنەماکانـی فەلسـەفە و یاسـاکانی ئاراسـتەکردنی عەقـڵ ، بنەمـای ئـەو زانسـت ناسـییەش پێکدەهێنێـت کـە بـە کارتیـزم ناسـراوە کـە بەمانـای دوانەیـی ئۆنتۆلۆژیـا کـە دوو مـاددەی سـنوردارن وەک (عەقـڵ ، رۆح) جەوهـەری عەقـڵ بیرکردنـەوەی خۆئـاگادارە هەروەهـا جەوهـەری مـاددە درێژبوونەوەیـە لەسـێ ڕەهەنـددا خـودا ماددەیەکـی یەکەمینـە و جەوهەرەکـەی هەبوونێکـی پێویسـتیە .

دواتـر یەکێـک لـە نووسـینەکانی تـری بریتیەلـە زنجیـرە نامەکانـی سـۆزەکانی رۆح کـە بریتیەلـە لەنەریتێکـی دوور و درێـژی لێکۆڵینـەوەی فەلسـەفی لەسروشـتی سـۆزەکان ، خولیـاکان ، ئەزموونـەکان ئێسـتا بەشـێوەکی بـاو لەسـەردەمی مۆدێرنـەدا پێیـان دەوترێـت (سـۆز) کەلەسـەردەمی ئەفلاتونـەوە بابەتـی مشـتومڕی فەیلەسـوف و زانایانـی ئاینـی بـووە ، دواتـر لاجیۆمێتـری لەسـاڵی **1637** وەک پاشـکۆیەک بـۆ دیسـکۆرس دی مانـای گوتـار لەسـەر میتـۆد بڵاوکرایـەوە کـە لەگوتـاردا شـێوازی خـۆی بـۆ بەدەسـتهێنانی روونـی لەسـەر هەربابەتێـک دەخاتـە ڕوو .

بەگشـتی سـەرنجێک دەخەینـە روو کـە یەکێکـە لـە مێدینەیتەرەکانـی ڕێنـی دیـکارت کەتیایـدا هاتـووە : خـودا وەک ماددەیەکـی بـێ کۆتایـی و ئەبـەدی و نەگـۆڕ هەروەهـا سـەربەخۆ و زیرەکـی ڕەهـا و دروسـتکەری هـەم خـۆی هـەم هەمـوو شـتێکی دیکـە بەلەبـەر چاوگرتنـی ئـەو بنەمـا فەلسـەفەی خودا ناسـی کـە سـەرچاوەکەی تێڕامانـە لـە خـود ناسـی تێدەگەیـن کـە بیرۆکـەی خـودا ناسـی دەبێـت واقعێکـی بابەتیـی و بێکۆتـا، ئەمـەش وادەکات سـەرنج لـەو تیۆریـە بدەیـن کـە خـودا نابێـت لەخۆیـەوە سـەرچاوەی گرتبێـت هەمـوو ئـەو سـەرنجدانەش یـەک سـەرچاوەی نەگـۆڕ و گرنـگ و بەهێـزی هەیـە کـە بریتیەلـە بـە پێویسـت بوونـی هەبوونـی خـودا ، لەکاتێکـدا دەتوانیـن گومـان لـە بوونـی هەرچـی شـت هەیـە بکەیـن بـەڵام هەبوونـی خـودا نەخێـر بـەو پێیەی تێڕوانینێکـی هێنـدە روون و جیـاوازی هەیـە بـۆ بوونـی خـودا بیرۆکەکـە واقعێکـی بابەتـی و بێکۆتایـی هەیـە، هـەر بۆیـە ئەگـەری راسـتبوونی زیاتـرە لەهەمـوو بیرۆکەیەکـی تـر پاشـان

و جووڵەتــە میتافیزیکیەکانــی مــرۆڤ و گــەردوون .

دیــکارت زۆر بەڕوونــی بــۆی دەرکــەوتــووە کــە خــودا بوونــی هەیــە ،چونکــە هەســتی دەکــرد بیــری دەکــردەوە ئەگــەر بیریشــی کــردەوە ئــەوە دەبێــت بەراســتەقینە،چونکە بیرکردنــەوە تەنهــا لــە عەقڵێکــی راســتی و ســروشــت و دیدگایەکــی خــاوەن پێشــینە و هاوراســت لەگــەڵ لۆژیــک و پێکهاتــەی میتافیزیکــی دێتــەوە ، بۆنموونــە ئەگــەر وجــوودی خــۆی نەبێــت چــۆن دەتوانێــت بیربکاتــەوە ؟ ئەگــەر بیریشــی کــردەوە ئــەوا ســەلماندی کــە بوونــی هەیــە دواتــر بنەماکانــی ئــەم چەمکــە فەلســەفیە بــوون بــە بیــرۆک و ناونــرا " پێموایــە ، بۆیــە منــم " هەروەهــا پێــی وابــوو کــە دەتوانێــت پیشــانی بــدات کــە هەبوونــی خــودا شــتێکی لۆژیکــی و نزیکــە لــە ناخــی هەمــوو مرۆڤێکــدا کــە لــە وتەیەکیــدا دەڵێــت : خــودا هەمــان بێکۆتاییــە و بەڕوونــی دەتوانێــت بێکۆتایی ببینێــت چونکــە دەتوانێــت بیر لەهەمــوو تەنێکــی گــەورەتــر بکاتــەوە ،بــەڵام هیــچ شــتێکی گــەورەتــر نیــە لــە وجــوودی خــودا .

لەکۆتایــدا دیــکات پێــی وابــووە لەبــەر



مێدیتەیتــەر ئەگــەری ئــەوە دەخاتــە ڕوو کــە ڕەنگــە تــەواو بێــت هەمــوو کەموکوڕییەکانــی پۆتانســێلن کەبەمانــی تاوانــی کەســێک یــان شــتێک بــۆ گەشــەکردن بەدەســتهێنان یــان ســەرکەوتن دێــت لەنــاو خۆیــدا و هێواش هێــواش بــەرەو کامــڵ بــوون بەرەپێــش چــوون دەچێــت ئەگــەر کامڵبــوون پۆتانســێلێک بێــت لەنــاو ئەودا ئــەوا جێی متمانەیــە کــە بیرۆکــەی خــودا بەبــێ هیــچ هۆکارێکــی دەرەکــی لەناویــدا بیری لێبکرێتــەوە ئــەم میتۆدەش ســەلمێنەری وجودیــەت و ئامادەیــی و دەســتکارایی خــودا دەســەلمێنێت لەهەمــوو گــۆران

ئـەوەی دەیزانـی بیردەکاتـەوە بـەڵام تەنها دەتوانێـت شـتێکی تـر لەبـارەی خۆیـەوە بزانێـت ،بـۆ نموونـە دوو قـۆڵ و دوو قاچـی هەیـە … چونکـە دەیزانـی خـودا بوونـی هەیـە هەمیشـە بـۆ نموونـەی وجودیەتـی خـودا بـەم جـۆرە شـیکاری بـۆ بیرۆکەکـەی کـردوە مرۆڤێـک دەبێت لـە دوو شـت پێکهاتبێـت وەک عەقـڵ کەبیـر دەکاتـەوە و ئـەو جەسـتەیەی کـە سـەربەخۆیە لەبیرکردنـەوە لەگـەڵ ئەوەشـدا پێکـەوە یەکگرتـوون ئەمـەش پێـی دەوترێـت "دوانەیزمـی کارتێـزی" .

دیـکارت زیاتـر بیرۆکـەی پەیوەنـدی داری بـە ئەفلاتـوون بەکارهێنـاوە و زیاتـر هاوبیـری بنەمـا فەلسـەفیەکانی ئـەو بـووە بەپێچەوانـەی زۆربـەی رۆشـنفکر و کەسـەکانی تـری سـەردەم کـە بیرۆکـەی پەیوەنـدی دار بـە ئەرسـتۆیان بەکارهێنـاوە لەبـەر ئەوەیـە زۆر جـار بـە عەقڵانـی ناوزەنـد دەکرێـت کـە بیرۆکـەی ئـەم چەمکـەش لـەوەوە هاتـووە کـە هەمیشـە ئـەو لەنـاو مێشـکیدا بـە وردی دەیڕوانـی و بۆوەڵامـی پرسـیارەکان و دەگـەڕا و شـیکردنەوەی وردی بـۆ دەکـردن تائـەوەی رووە فەلسـەفیەکەی ببینێـت و شـیکاریانەتر لیێڕوانێـت ، هەرچەنـدە دیـکارت ویسـتوویەتی لەگوومـان دوور بکەوێتـەوە و ئـەوەی سـیناریۆی گوماناوی هەیـە پشـتگوێی بخـات چونکـە ئـەو پێـی وابـووە کـە کاری سـەرەکی ئـەو یەکلاکردنـەوەی ئـەو شـتانەیە کـە چەنـد رەهەندێکیـان هەیـە و گومانـن لای خەڵکـی دواتـر لـە چوارچێـوەی ئـەو پـەڕی لۆژیـک و ئـاواز بونیـات بندرێتـەوە و رووی راسـتەقینە و چەمکـی مـاددەکان بەئاشـکرا دەربکەوێـت ،هەرچەنـدە لـە میدیتەیشـنەکانیدا وەسـفکردنی گومـان زۆر بـەدی دەکرێـت ،بەڵام هێشـتا بـە دووری لێـی روانیـوە .





د. ئەکرەم میهرداد

# دیدگاکان بۆ ناسینی پرسی ژنان

پرس. دیاردەو راستییەکانی مرۆڤایەتی کەبەشێکی زۆر کاریگەرە لەژیانی هەموومان. بەردەوام زۆریەی بیرمەندان و بیریارانی بەخۆوە خەریک کردووە. هەوڵدان بۆ بەدەستهێنانی راستینەی مرۆڤایەتیمان لەو دیاردەو پرسانەدا بۆتە کاری فکرو فەلسەفەو زانست. ئەو دیدگایانەی کە دەیانەوێ جیهانی دەوروبەرمان بناسن و پاشان ئەو جیهانە بەرەو بەهرەمەندی و ئازادی زیاتر بەرن. بۆ خۆشیان بوونەتە دیاردەو راستی کۆمەڵایەتی و مرۆڤایەتی. هەوڵەکانی مرۆڤ لەناو بزاڤ و کاریگەرییەکاندا بەشێکی ئەم کارەیان بەدیهێناوە. ئەوەی بۆ من گرنگەو پەیوەندی بەناونیشانی نووسینەکەوە هەیە. ئەوەیە کەباس لەچۆنیەتی ناسینی راستییەکانی مرۆڤایەتی بکەم و پاشان ئەم چۆن ناسینە سەبارەت بەپرس و ناسنامەی بزاڤی ژنان بخەمەڕوو. سەرەنجامیش رێبازی ناسین یان (میتۆد) باشتر دەتوانێ کەراستینەی کێشەو ژیانی ژنان بنەخشێنێ. ناسینی باشتری راستینەکانی مرۆڤایەتی و لەناویاندا پرسی ژنان بەهۆی شارەزایی و ناسینی ئێمەوە دەبێت لەرێبازەکانی بیرو فەلسەفە سەبارەت بەدیاردەو راستیە کۆمەڵایەتییەکان. بۆ ئەم مەبەستە پەنا دەبەمە بەر چەند بیرو میتۆدی بیریاری و فەلسەفی کەبەهرەمەندمان دەکەن لەناسینی ئایندەمان و پرسی

مەبەستمان باشتر ڕۆشن دەکەنەوەو بەهۆی ئەو ڕۆشن ناسینەشەوە باشتر دەتوانین لەلایەنە جیاوازو فرەکانی ژیانمان بەهرەمەندبین.

یەکەم:

ئێمە لەناسینی دیاردەکانی کۆمەڵایەتی و مرۆڤایەتیدا هەرگیز ناتوانین راستی رەهاو تەواو بەدەستبهێنین. بەڵکو لەو ناسینە (یان ناسینانەدا) تەنیا لەسنوورەکانی راستی نزیک دەبینەوەو ئەنجامی بەتەواوی راست و دروست لەدیاردەی کۆمەڵایەتی و مرۆڤایەتیدا پەیدا نابێت. لەزانستی سروشتی و زانستەکانی دیکەی ماتماتیک، بایۆلۆجی و کیمیاو فیزیادا دەتوانین راستی تەواو پەیدابکەین. نموونەی ئەمانەش ئەوەیە لەناسینی ماتماتیکی و شێوەییدا بەهەمووجۆرێک ئەنجامی تەواو راست بەدەست دەهێنین. هەروەها ئەو رەوشە بۆ ناسینی زانستی ئەزموونی یان تاقیکاری (بایۆلۆجی، کیمیاو فیزیک) هەر بەو شێوەیەیە. بەڵام لەزانست و دیاردەکانی کۆمەڵایەتی و مرۆڤایەتیدا ئەو راستییە نەگۆڕو تەواوانە بەدەست نایەت و تەنها ئەنجامەکانی ئێمە لەو بیرو فەلسەفانەدا نزیک لەراستییە یان شێوەیەکی (تقریبی)ن. دیاردەکانی کۆمەڵایەتی و راستییەکانی مرۆڤایەتی وەکو دیموکراسی، سۆسیالیزم، نەتەوایەتی، فیمینیزم، مۆدێرن و پۆست مۆدێرن نەیانتوانیوە راستینەی تەواوی ژیانی مرۆڤایەتی یان هەلومەرجی ئازادی و بەهرەمەندبوونی رەها بەدەست

بهێنن. بەڵکو ئەمانە بەشێکە لەو هەولانەی کە یارمەتیدەری ژیانی مرۆڤایەتیەو لەداهاتووشدا کاریگەری دەبێ.

لەکاتێکدا کەباسی ئەم خاڵە دەکەم. مەبەستم ئەوە نییە لەبایەخ و گرنگی دیاردەو راستییە مرۆڤایەتیەکان کەم بکەمەوە. بەڵکو هیوای ئەوە دەخوازم کەخۆمان و دیاردەکانیش رزگارو ئازادتر بکەین لەسەخت روانین و تاک رەهەندی و تاک ئەندێشەی و ئاسۆیەکی دیکەش بۆ بیروباوەڕەکان پەیدابکەین. سەرئەنجام بەیارمەتی ئاسۆو بیرەکان تواناو دەسەلاتی زیاتر. ئەگەری گەشەو فراوانبوون بۆ پرس و راستیە مرۆڤایەتیەکان فەراهەم بکەین.

ئەگەر پرس و ناسنامەی ژنان یان راستینەی بزافی ژنان بۆ ئازادی و یەکسانی لەمافەکاندا وەکو راستیەکانی مرۆڤایەتی تەماشابکەین (کە بێگومان هەروایە) ئایا دەتوانین بەهاوکاری و رۆشن بینی هەموو دیدگاو هەولەکان لەراستینەی تەواوی پرسی ژنان نزیک ببینەوە؟

یان هەموو ئەم هەولانە چەند وێستگایەکن بۆ باشترو رۆشنتر ناسینی راستینەی ژنان! زانستی کۆمەڵناسی فێرمان دەکات کە بەچ شێوەیەک لەگەڵ دیاردەو راستیە کۆمەلایەتیەکاندا مامەڵە بکەین و چۆن بتوانین لەو مامەڵەیەدا زیاتر لەراستی نزیک ببینەوە.

کۆمەڵناسی پێمان دەڵێت کەسێ ئاستی گرنگ هەیە بۆ ناسینی دیاردەو راستییەکانی کۆمەلایەتی کەئەوانیش ریالیزم. هێرمۆنیتکاو تیۆری رەخنەیین(١.

باپرسی ژنان و ناسنامەی ئەوان وەکو راستی یان وەک ریالیزمێک چاولێبکەین. بەلام هێرمۆنتیکا یان تەئویل کردن (واتە فرەیی و جیاوازی لەلێکۆڵینەوەو شیکردنەوەدا) دەتوانێ زیاتر لەرێگایەکمان بۆ پەیدابکات بۆ نزیکبوونەوە لەراستی یان لەراستییەکان و پاشان رەخنەی ئێمە یان دیدگای تایبەتی و تێڕوانینی فەلسەفی و سیاسیمان دەتوانێ مەبەستی تایبەتی ئێمە یان ئەو دیدگاو فەلسەفە تایبەتیە باشتر بنەخشێنێ بۆ ئازادی و بەهرەمەندبوون.

*مافەکانی ژنان و سەرەتاکانی خەبات بوون و بەردەوامبوونی توندوتیژی لەکۆمەڵگاکانداو بەتایبەتی لەکۆمەڵگا رۆژهەلاتی و دواکەوتووەکاندا پەیوەندی بەهەندێک

زەمینـەی کۆمـەڵایـەتـی، ئابووری، سیاسـی، ئاینـی و نەریتیـەوە هەیـە. ئـەو زەمینانـە وایانکـردووە بـۆ مافـی و نەبوونـی ئـازادی بەسـەر ژنانـدا بسـەپێنرێ و هـەر ئـەو زەمینانـەش وایانکـردووە کـە ژێردەسـتەیی و پیادەکردنـی توندوتیـژی لەسـەر ئـەوان بـەردەوام بێـت ببێتـە بەشـێک لەژیانـی ئـەو کۆمەڵگایانـە. دەسـەڵات و هەژمـوون و راسـتینەی پیاوانـە کەهەمـو لایەنەکانـی ژیانـی ئـەو وڵات و کۆمەڵانـەی گرتۆتـەوە. لەراسـتیدا هەلومەرجێکـی سروشـتی و لەخـۆوە پەیدابـوو نییـە، بەڵکـو دەسـەڵاتی سـەپێنراوی پیاوانیـش وادەکات کەزەمینەکانـی ژیانـی ئابـووری، کۆمەڵایەتـی، سیاسـی و نەریتـی لـەو کۆمەڵگانـە لەبەرژەوەنـدی ژنـان نەبێـت و هەتـا دێت ئەو زەمینانە رۆژرەشـی و دیلێتی ژنـان و منـداڵان و لاوان و پەراوێزکـراوەکان قـووڵ و فراوانتـر دەکاتـەوە. هـەر لـەو روانگەیـەوە کـە هەمـوو راسـتییەکی مرۆڤایەتـی راسـتیەکی دروسـتکراو یـان سـەپێنراوە. هـەر بۆیـە دەتوانیـن وا بیربکەینـەوە کـە لەروانگـەو بەرژەوەنـدی چەوسـاوەکان و پەراوێزکـراوەکان یـان لەروانگـەو بەرژەوەنـدی ژنـان و لاوان و منداڵانـی بێدەسـەڵاتەوە راسـتیەکی تـازە یـان زەمینەکانـی کۆمەڵایەتـی و گشـتی جیـاواز لـەو زەمینـە کـۆن و

پێوەری گشتی عەدالەت و دادپەروەری کۆمەڵایەتی دەتوانێ بکرێتە پێوەری ماف و ئازادییەکان لەسەرانسەری جیهاندا کەباشترین زەمینەو گرەنتیە بۆ هێنانەدی کۆمەڵگایەکی ئازادو بەهرەمەند و مرۆڤدۆست.





نەریتیانە پەیدابکەین. هێزی نارەزایی و بزاڤی ماف و ئازادییەکان لەروانگەی کە بتوانن ماف و ئازادییەکانی ئەوان فەرهەم بکات و هەر لەم روانگەیەشەوە هەلومەرجی نالەبارو توندوتیژی لەسەریان کۆتایی پێ بهێنرێت.

لەو کۆمەڵگایانەی کە تازە هاتوونەتە ناو ئاستانەی دیموکراسیەوە. سەرەتا ئاڵۆزییەکی سەخت هەیە بۆ بەفەرمی ناسینی ئازادییەکان و دابینکردنی ئەو زەمینە گشتیانەی کە ئەو ماف و ئازادییانە بەدی دەهێنێت. بەڵام بەشێوەیەکی گشتی باشترین رێگا بۆ هێنانەدی ئەو زەمینانە لەسێ هۆکاردا خۆی دەبینێت:

-١ناسین و سەلماندنی ماف و ئازادییەکانی هەمو تاک و هاووڵاتیەکانی ناو کۆمەڵگا بەپێی دەستوورو یاسا.

-٢بوونی دەسەڵات و سیستەمێکی دیموکراتی گونجاو کەبتوانێ و بیەوێ ئەو ماف و ئازادیانە جێبەجێبکات.

-٣بوونی بزاڤی کۆمەڵایەتی و جەماوەری وەها کە هەمیشە زامنکەرو بەدیهێنەری ماف و ئازادییەکانی ناو دەستووری دڵخوازبێت.

ئەگەرچی لەوڵاتی ئێمە چەندین رێگرو کۆسپ هەیە لەبەردەمی ئەو سێ هۆکارو هێزەدا. بەڵام ئێمەش وەکو بەشی زۆربەی وڵاتانی جیهان ناچارین کە هەوڵ و تێکۆشانێکی کۆمەڵایەتی بدەین بۆ پەیداکردن و ئاواکردنی ئەو

زەمینانە. لەبەرئەوەی باسەکەمان هاتەسەر ناسین و سەلماندنی ماف و ئازادییەکان بەشێوەی فەرمی لەیاساو دەستووردا. هەر بۆیە سەرەتا بەمافی گشتی و زەمینە یاساییەکانی ئەو مافانە دەست پێدەکەین، کەئەوانیش بەدەوری خۆیان کاریگەری فراوانیان دەبێ لەسەر کەمکردنەوە یان نەهێشتنی توندوتیژی لەدژی ژنان.

ا- ناسین و سەلماندنی مافەکانی تاک لەیاساو دەستووری گشتیدا وەکو مافی پیرۆز، سروشتی و تەواوی هەموو تاکێک. سەرەتا ئەو مافانەش بەمافی سروشتی و سەرەتایی دەستپێدەکات لەدابینکردنی (خواردن، پۆشاک، شوێنی ژیان، تەندروستی، پەروەردەو فێرکردن، ئاسایش، لایەنی سۆزداری و سێکسی، کار یان بیمەی بێکاری)و پاشان دێتە سەر ئازادی و ئازادی بیروباوەڕو ویژدان و نارەزایی و خۆرێکخستن. سەرەنجام مافی خۆسەپاندنی خودەکان و تاکەکان و رێزی ئەوان لەدەستووری گشتیدا دەبێت ئاشکراو ناسراوبێت. ئەرکی راستەوخۆی دەوڵەت ئەوەیە کە ئەو مافانەی بەپێی دەستوور گرەنتی بکات و لەدەستی کەسانی دیکە، لەدەستی گروپەکان، دین و نەتەوەو مەزهەب و پارت و خێڵەکان بسەنرێتەوەو بدرێتەوە بەتاک و وەکو مافی فەرمی و سروشتی بێ ئەملاولایان بناسرێت.

بۆ ئەو کەسانەی تەمەنیان لەسەرووی ١٨ ساڵە (کیژان و کوڕان) دەبێت بەفەرمی بەهرەمەندبن لەو مافانەو نابێ ئەوان ناچاربکرێت لەگەڵ دایکان و باوکان یان لەگەڵ بەتەمەنەکان بژین، بەڵکو دەبێ ئازادبن لەسەربەخۆ ژیان و بەجیا ژیان لەوان، مافی کارکردن و مافی بیمەی بێکاری کە یەکێکە لەمافە سەرەتاییەکان، ئەرک و مافی هەموو کەسێکەو دەبێ یاساو دەستووری وڵات ئەوانە بەفەرمی و بەگشتی بناسێ. مافی منداڵان و بەخێوکردن و پەروەردەکردنیان، هەروەها مافی ئەوان کە لەلێدان و ئازاردان بەدووربن و دەبێت ئەم مافانە بەپێی یاساو دەستووری گشتی بۆ هەموو منداڵێک بناسرێ. نابێ ئەو مافانە بخرێتە دەست دایکان و باوکان و مامۆستایان (یان دەستی هەر کەسێکی دیکە) واتە بەخێوکردن و پەروەردەکردن و فێرکردنی منداڵان ئەرکی فەرمی دەوڵەتە.

پێوەری گشتی عەدالەت و دادپەروەری کۆمەڵایەتی دەتوانێ بکرێتە پێوەری ماف و ئازادییەکان لەسەرانسەری جیهاندا کەباشترین زەمینەو گرەنتیە

بۆ هێنانەدی کۆمەڵگایەکی ئازادو بەهرەمەندو مرۆڤدۆست، پێوەرە گشتیەکانی عەدالەت لەلای هەردوو بیروباوەڕی سۆسیالیزم و لیبرالیزمی سۆسیالیستی یان پێشکەوتوخواز، کەسەرەنجام دەبێتە بنەمای سەرەکی ماف و ئازادی لەدەوڵەتی رەفادا سێ پێوەری گشتی و جیهانییە، کەئەمانەن:

-١دابینکردن و گرەنتیکردنی ماف و ئازادی و ستانداردی گشتی و جیهانی ئەو ماف و ئازادیانە، واتە پەیڕەوکردنی (جارنامەی جیهانی مافەکانی مرۆڤ) لەسەر هەر سێ ئاستی تاک، کۆمەڵگاو دەوڵەت.

-٢کارکردن بەبنەمای یارمەتی و فریاکەوتنی کەس و لایەنە زۆر هەژارو نەدارەکان یان بێ هێزو پەراوێزکراوەکان و گەیاندنی ئەوان بۆ ئاستی چینی ناوەراست و کارکردن بەبنەمای دابەشکردنەوەی سەرلەنوێی سامانی کۆمەڵایەتی.

-٣بێگومان ئەم دوو پێوەرە لەئێستای جیهاندا تەنها بەدەوڵەت و دەستوور دەکرێت، واتە بەشداری راستەوخۆو مرۆڤانەی دەوڵەت لەو زەمینانەدا(٢).(

ب-رەخساندنی هەلی یاسایی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و سیاسی یەکسان و یاسایی بۆ هەموو تاکەکانی کۆمەڵ بۆ بەهرەمەندبوون لەژیانی ئابووری و یاسایی بەجۆرێکی وەها کە مافەکانی ژنان و لاوان و منداڵانی تیا دەستەبەربکرێ، واتە دەبێ بەپێی دەستوورو یاسا هەلی یەکسان بۆ کارکردن، خوێندن، بەشداری لەژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسی و فەرهەنگی بۆ هەموو تاکێک دابینبکرێت و لەم نێوانەدا هیچ جیاوازی و هەڵاواردن لەنێوان ژنان و پیاوان نەکرێت. یەکسانی لەبەردەم یاسادا سەرەتایەکی زۆر گرنگەو بۆ ئەو مەبەستە هەموو تاکێک لەبەرامبەر ئەرک و مافە یاساییەکاندا دەبێ یەکسان بێت و سەروەری و دەسەڵاتی یاساش هەموان بگرێتەوە. ئەگەرچی هەندێ وڵاتانی جیهان لەیاساو دەستوورەکانیاندا باس لەیەکسانی و گشتیبوونی یاسا دەکەن (کەبوونی ئەم زەمینەیە مەرجێکی زۆر گرنگە بۆ ماف و ئازادی) بەڵام ئەو هێزەی کە بەقازانجی ژنان و لاوان و منداڵان رەوشەکە دەگۆڕێت، بزووتنەوەی جەماوەری و رێکخراوەیی ئەوانە بۆ دابینکردن و پاراستن و بەردەوامکردنی ئەو ماف و یەکسانیانە.

پ-بەهرەمەندبوونی یاسایی و

گشتی لەمافەکانی ئازادی بیروڕا، خۆڕێکخستن و خۆپیشاندان و ڕەخنەو نەیاری، مافێکی زۆر گرنگ و پێوەری شارستانی و ئازادیخوازیە بۆ گرەنتیکردن و پاراستنی ماف و ئازادییەکان لەبەرامبەر سنووردارکردن یان پێشێلکردنیان.

ت-دەبێ بەپێی یاسا هەموو فشارێکی جەستەیی، دەروونی و ڕۆحی لەدژی ژنان، منداڵان و لاوان کۆتایی پێ بێت، لێدان و سوکایەتی کردن بەژنان و منداڵان دەبێ بەپێی یاسا قەدەغە بکرێت و هەر کەسێک کارێکی لەو جۆرە بکات دەبێ وەکو تاوانبار سەیربکرێت و سزابدرێت. مەبەستمان لەم خاڵە ئەوەیە کەدیسان نابێ لێدان و سووکایەتی بەنیوە یان بەشی زۆری کۆمەڵ بۆ لێکدانەوەو ئارەزووی تاک یان هێزێک کەس بەجێ بهێڵین و بەڵکو دەبێ وەکو لایەنێکی گشتی و یاسایی مامەڵەی لەگەڵ بکرێ.

ج-لەبەرئەوەی کەژیانی سۆزداری و هاوسەری ڕێکەوتنی دوولایەنەیە لەنێوان ژن و پیاو بۆیە دەبێ مافی جیابوونەوەش بۆ هەردوولا بەپێی یاسا گرەنتی بکرێت. واتە هەردوولا (نەک تەنیا پیاو) دەبێ بەهرەمەندبن لەمافی ڕەهای پەیوەندی یان کۆتاییهێنان بەو ژیانە هاوبەشەو جیابوونەوە.

ئەمانە ئەو زەمینە گشتی و یاساییانەن کە بەهۆی هۆشیاری و پیادەکردن و بوونی ماف و داواکارییەکانی ژنانەوە دەتوانرێ بکرێتە سەرەتایەکی گونجاو بۆ نەهێشتنی توندوتیژی و نایەکسانی لەدژی ژنان. دیدگاکانی یەکسانی یان بیروباوەڕی لیبرالی، مارکسی و کانتی بۆ مەسەلەی مافی یەکسانی، کەهەریەک لەوان بەجۆرێک باسی یەکسانی نێوان تاک کۆمەڵەکان دەکەن. هەریەک لەوان شێوەیەکە لە(مانادان)و پێشخستنی مانایەک لەماناکان و یان فرەیی و جیاوازی لەمانادا ئەوە دەسەلمێنێت کەهێرمۆنتیکای ریالیزمی دیاردەو هەلومەرجەکانی ژیانمان بۆ پەیداکردنی ڕاستی یان چەند ڕاستییەک. ئەوە دەسەلمێنێت کەئێمە لەناسینی ڕاستییەکانی کۆمەلایەتی و مرۆڤایەتی و ڕاستی ڕەهاو تەواو بەدەست ناهێنین. بەڵکو لەسنوورەکانی ڕاستیەکان نزیک دەبینەوە.



# تێڕوانینێک بۆ ململانێکانی ئۆکرانیا

ئیدریس جەبار

مێژووی دەستپێکردنی ململانێکان لە ئۆکرانیا بۆ پێش ئۆپەراسیۆنە تایبەتەکەی ڕووسیا دەگەڕێتەوە و ڕەگوڕیشەی دێرینترە لەو هەڵبژاردنە پەرلەمانیانەش کە لە دوای ڕوخانی یەکێتی سۆڤیەت لە وڵاتەکەدا سازکران. بەڵام دەکرێت ئەو «هەڵبژاردنانە» بە دەستپێکی ڕاشکاوانەی ململانێکان لە ئۆکرانیا دابنرێن کە ڕۆشنتر بەریەککەوتنەکانی نێوان ڕووسیا و خۆرئاوایان لە وڵاتەکەدا دەرخست.

ڕەوشی ناوخۆی ئۆکرانیا بەهۆی دەستوەردانی مۆسکۆ و پایتەختە خۆرئاواییەکان لە دوای ساڵانی ٢٠٠٠ەوە ململانێی توندی لەنێوان لایەنگرانی کرملین و لایەنگرانی «دیموکاتی خۆرئاوایی» بەخۆوەبینی، ئەمەش

ڕەوشەکەی گەیاندە کورد واتەنی «بگرە و بەردە». هەڵبژاردنەکان تایەک بە سەرکەوتنی لایەنگرانی مۆسکۆ و تایەکی دی بە سەرکەوتنی لایەنگرانی خۆرئاوا کۆتاییان دەهات.

هەڵبژاردنەکان خواستی لایەنە دەستبالاکانی تێرنەدەکرد، بۆیە دەستبردن بۆ خۆپیشاندانی نارەزایی و نزیکبوونەوە لە پێکداهەڵپژانی نێوخۆیی و بەریەککەوتنی ناڕاستەوخۆ، کرایە ڕێگەچارەو ڕێڕەوێک بۆ یەکلایی کردنەوەی هاوکێشەکە.

## شۆڕشی پرتەقاڵی

شۆڕشی پرتەقاڵی یان شۆڕشی هەمەڕەنگ، لەنێوان ساڵانی (٢٠٠٤-٢٠٠٥) لەڕێی زنجیرەیەک لە خۆپیشاندانی نارەزایی و ڕووداوی سیاسی بەرپابوو کە لە دوای گەری دەنگدانەوە لە هەڵبژاردنی سەرۆکایەتی ئۆکراینا لە ٢٠٠٤وە هاتەئارا، بەو هۆیەی دەگوترا پرۆسەکە گەندەڵی فراوانی بەخۆوەبنیوە و دەنگدەران تۆقێنراون و گەندەڵی ڕاستەوخۆ لە هەڵبژاردندا کراوە.

کێیف پایتەختی ئۆکراینا، خاڵ و چەقی جموجۆڵی ڕۆژانەی هەزاران خۆپیشاندەری نارازیی بوو، بەهۆی

یانۆکۆڤیچ لە دوای چوار ساڵ لە ڕووبەڕووبوونەوەکانی گۆڕەپانی سەربەخۆیی لە کێیف لە بوونە مایەی گیان لەدەستدانی زیاتر لە 100 کەس، لە شوباتی 2014 لە دەسەڵات دورخرایەوە.

ململانێکان لەسەر دەسەڵات لەنێوان هەردوو لایەن کە بریتیبوون لە: لایەنی یەکەم: ڤیکتۆر یوشیشینکۆ سەرۆک کۆمار، و یولیا تیمۆشینکۆی هاوپەیمانی کە سەرۆکی فراکسیۆنی ئۆپۆزسیۆنی پەرلەمانی (کەمینە) بوو، لایەنی دووەم: ڤیکتۆر یانکۆڤیچ و هاوپەیمانەکانی کە لە سەرکردەکانی فراکسیۆنە پەرلەمانییەکان کە زۆرینە پێکهاتبوون، ئەمەش بووە مایەی دروستبوونی حاڵەتێکی چەقبەستنی پرۆسەی سیاسی لە وڵاتەکە.

خۆپیشاندانەکانی نارەزایی لە دوای بڵاوبوونەوەی راپۆرتی چاودێرانی خۆجێی و بیانی بوو لەسەر هەڵبژاردنەکە. لەگەڵ دروستبوونی دیدێکی میللی فراوان لەسەر دەنگدانەکەی ٢١ی تشرینی دووەمی ٢٠٠٤، لەنێوان کاندیدە سەرەکییەکانی ڤیکتۆر یوشینکۆ و ڤیکتۆر یانکۆڤیچ کە دەگوترا لەلایەن دەسەڵاتدارانەوە بۆ بەرژەوەندی یانکۆڤیچ ساختەکراوە. خۆپیشاندانەکانی نارەزایی کە تەواوی ئۆکرانیایان گرتەوە، بوونە مایەی هەڵوەشاندنەوەی دەنگدانەکە. دادگای باڵای وڵاتەکەش بریاریدا بەدووبارەکردنەوەی دەنگدان لە ٢٦ی کانوونی یەکەمی ٢٠٠٤، لەژێر چاودێرییەکی توندی چاودێرە خۆجێی و نێودەوڵەتییەکان، دەنگدانی دووەم بە پرۆسەیەکی «پاک و بێخەوش و ئازاد» راگەیەندرا.

ئاکامی کۆتایی هەڵبژاردنی دووەم سەرکەوتنێکی روونی یۆشینکۆی دەرخست کە نزیکەی ٥٢٪ی دەنگەکانی دەستەبەرکردبوو، بەرامبەر بە ٤٤٪ی بۆ یانکۆڤیچ.

بە فەرمی سەرکەوتنی یۆشینکۆ راگەیەندرا و لەگەڵ دەستنیشانکردن و دانانی بە سەرۆک لە ٢٣ی کانوونی دووەمی ٢٠٠٥ لە کێیڤ، بەمشێوەیە شۆڕشی پرتەقاڵی کۆتایی هات.

لە ساڵانی دوایيدا، شۆڕشی پرتەقاڵی دەستەواژەیەکی نەرێنی بۆ ناوەندەکانی سەر بە حکومەت لە بیلاڕووسیا و رووسیا پەیدا کرد.

لە هەڵبژاردنی سەرۆکایەتی ساڵی ٢٠١٠، یانکۆڤیچ لە جێگەی یۆشینکۆ بوو بە سەرۆکی ئۆکرانیا، پاش ئەوەی کۆمیتەی ناوەندی هەڵبژاردنەکان و چاودێرانی نێودەوڵەتی هەڵبژاردنی سەرۆکایەتییان لە وڵاتەکەدا بە بێخەوش راگەیاند.

یانکۆڤیچ لە دوای چوار ساڵ




لە ڕووبەڕووبوونەوەکانی گۆڕەپانی سەربەخۆیی لە کییڤ کە بوونە مایەی گیان لەدەستدانی زیاتر لە ١٠٠ کەس، لە شوباتی ٢٠١٤ لە دەسەڵات دورخرایەوە.

## بیانووی ڕووسیا بۆ ئۆپەراسیۆنە سەربازییەکەی لە ئۆکرانیا

ڕووسیا لە ٢٤ی شوباتی ٢٠٢٢ ئۆپەراسیۆنە سەربازییەکەی بە ناوی «ئۆپەراسیۆنی تایبەت» لە ئۆکراینا دەستپێکرد. دوای چەند مانگێک لە درێژەکێشانی ئۆپەراسیۆنە سەربازیە. مۆسکۆ لکاندنی ناوچەکانی دۆنێتسک و لۆگانسک و خێرسۆن و زابۆرۆژیای بە یەکێتی ڕووسیای فیدراڵەوە ڕاگەیاند. ئۆکراینا ڕووی لە خۆرئاوا کردەوە. لەڕێی خواستی وڵاتەکە بۆ چوونە پاڵ هاوپەیمانی باکووری ئەتڵەسی «ناتۆ» و پاشان هەنگاونان بۆ بوون بە ئەندام لە یەکێتی ئەوروپا. ئەمەش بە بۆچوونی ڕووسەکان. هەڕەشە و مەترسی بەردەوام لەسەر ئاسایش و پەرەسەندن و بوونی وڵاتەکەیان دروست دەکات. سێرگی ناریشکین سەرۆکی هەواڵگری دەرەوەی ڕووسیا لەو بارەوە دەڵێت:«ئەو کارەی کییڤ. ئایندەی ڕووسیا و پێگەی ئایندەی



ولاتەکەیان لە جیهاندا دەخاتە سەر مەحەک».
ڤلادیمێر پۆتین سەرۆکی ڕووسیا، ئامانجی سەرەکی ئۆپەراسیۆنە سەربازییەکە لە:»داماڵینی چەک لە ئۆکراینا و ڕیشەکێشکردنی نازیزم». کۆدەکاتەوە بۆ »پاراستن و پارێزگاریی لەوانەی ٨ ساڵە ڕووبەڕووی ڕەگەزپەرستی و کۆمەڵکوژی بونەتەوە بەدەستی حکومەتی ئۆکرانی».
ڕەتیشیکردبۆوە:»لە پلانیاندا بێت خاکی ئۆکرانیا داگیربکەن و بە هێز هیچ شتێک بەسەر ئەوانی دی بسەپێنن».
لەو دەمەی ئۆکراینا لەدوای ڕوخانی یەکێتی سۆڤیەت لە ساڵی ١٩٩١، سەربەخۆیی وەرگرت، ڕووی لە خۆرئاوا و هەریەک لە یەکێتی ئەوروپا و هاوپەیمانی باکووری ئەتڵەسی «ناتۆ» کرد.

## ناوچەی کریمیا و جوداخوازانی خۆرهەڵات

ڤلادیمێر پۆتین سەرۆکی ڕووسیا لە ساڵی ٢٠١٣ گوشاری خستە سەر ڤیکتۆر یانکۆڤیچ سەرۆکی ئۆکرانی سەر بە مۆسکۆ، تا ڕێککەوتن لەگەڵ یەکێتی ئەوروپا ئیمزا نەکات.

لە 17ی حوزەیرانی 2022 کۆمسیۆنی ئەوروپا، ئەنجومەنی ئەوروپای ڕاسپارد، ڕێگە بۆ کاندیدکردنی ئۆکرانیا بۆ هاتنەپاڵ یەکێتی ئەوروپا خۆشبکات.
لە 23ی حوزەیرانی 2022، پەرلەمانی ئەوروپا پشتی بە بڕیارێک بەست کە داوا دەکات، دەستبەجێ ڕەوشی کاندیدی ئەندام بوون لە یەکێتی ئەوروپا ببەخشرێت بە ئۆکرانیا

ئەمــەش بــووە مایــەی بەرپابوونــی خۆپیشــاندانەکانی نارەزایــی لــە وڵاتەکــەدا و دواجــار لــە مانگــی شــوباتی ٢٠١٤ دەســەڵاتەکەی یانکۆڤیــچ رووخــا. رووســیا بــە دەســتگرتن بەســەر ناوچــەی کریمیــای باشــوور لــە ئۆکرانیــا وەڵامــی دایــەوە و یاخیبوونــی لــە خۆرهــەڵات وروژانــد و پشــتیوانی لــەو جوداخوازانــە کــرد کــە بــۆ مــاوەی ٨ ســاڵ بــوو دژ بــە هێزەکانــی ئۆکرانیــا لــە جەنگدابــوون و تێیــدا ١٤ هــەزار کــەس بوونــە قوربانــی. ئاگربەســت و رێککەوتنــی ئاشــتی مینســک هەبــوو لــە ســاڵی ٢٠١٥ کــە هەرگیــز جێبەجێنەکــرا. پێــش ماوەیــەک لــە دەســتپێکردنی هێرشــەکانی بــۆ ســەر ئۆکرانیــا، ســەرۆک پۆتیــن رێککەوتنــی ئاشــتی دڕانــد و دانــی نــا بــە دوو دەوڵەتــی بچــووک کــە لەلایــەن رووســیاوە پشــتیوانی دەکــران، وەک دەوڵەتــی ســەربەخۆی جیابــۆوە لــە ئۆکرانیــا.

کاتێــک هێزەکانــی رەوانــەی ئۆکرانیــا کــرد، پۆتیــن ناتــۆی بــە هەرەشــەکردن لــە «ئاینــدەی مێژوویــان وەک نەتــەوە» تۆمەتبارکــرد و ئامــاژەی بە گواســتنەوەی جەنــگ کــرد لەلایــەن ناتــۆوە بــۆ کریمیــا. رووســیا بــەر لــە جەنــگ داوای کــردبــوو رێگــە لــە هەمــوو چەکــە ئەتۆمییەکانی ئەمریــکا بگیرێــت لــە ویلایەتــە یەکگرتــووەکان ببرێنــە دەرەوە.

ویلایەتــە یەکگرتــووەکان پێشــنیازی دەســتپێکردنی وتوێــژی کردبــوو بــۆ بەرگرتــن لــە مووشــەکە کــورت و مامناوەنــد مــەوداکان، و بەڵێننامــەی نــوێ ســەبارەت بــە مووشــەکە کیشــوەربڕەکان، بــەڵام هەلێکــی کــەم هەبــوو بــۆ ســازدانی ئــەو وتوێژانــە. رووســیا ترســی ئــەوەی هەبــوو بکەوێتــە گێــژاوی جەنگێکــی نوێــی ســاردەوە، بۆیە خــۆی بــۆ ئاگادارکردنەوەیەکــی نوێــی بەهێــزی خۆرئــاوا ئامادەکــرد کــە توندتر و زیاتــر ســەربازی بێــت.

## ئۆکرانیا و یەکێتی ئەوروپا

لــە ٢٨ی شــوباتی ٢٠٢٢، دوای ماوەیەکــی کــەم لــە دەســتپێکردنی داگیرکاریەکــەی رووســیا، ئۆکرانیــا داوای پێشــکەش کــرد، تــا ببێتــە ئەنــدام لــە یەکێتــی ئەوروپــا، ڤۆڵۆدیمێــر زیلینســکی ســەرۆکی ئۆکرانیــاش داوای کــرد بەپێــی «رێکارێکــی تایبــەت و نــوێ»، دەســتبەجێ داواکارییەکەیــان جێبەجــێ بکرێــت، داوای لــە ســەرکردەکانی هەشــت






وڵاتی یەکێتی ئەروپا کرد. پرۆسەی چوونەناوەوەی وڵاتەکەی خێرا بکرێت. لەبەرامبەردا ئۆرسوڵا فۆن دێر لاین سەرۆکی کۆمسیۆنی ئەوروپا رایگەیاندبوو. پشتیوانی لە هاتنەناوەوەی ئۆکراینا دەکات بۆ یەکێتییەکە. بەڵام پرۆسەکە کاتی دەوێت.

لە ١ی ئاداری ٢٠٢٢. پەرلەمانی ئەروپا راسپاردەیەکی پێشکەشکرد. تا بە فەرمی ئۆکرانیا بۆ ئەندام بوون کاندید بکرێت. لە ١٠ی ئاداری ٢٠٢٢ ئەنجومەنی یەکێتی ئەوروپا داوای لە کۆمسیۆنی ئەوروپایی کرد. راوبۆچوونی خۆی لەبارەی داواکارییەکە بخاتەڕوو. لە ٨ی نیسانی ٢٠٢٢. فۆن دێر لاین روونکردنەوەیەکی یاسایی پێشکەش بە زیلینسکی کرد و ئۆکرانیاش لە ١٧ی نیساندا وەڵامی دایەوە.

لە ١٧ی حوزەیرانی ٢٠٢٢ کۆمسیۆنی ئەوروپا. ئەنجومەنی ئەوروپای راسپارد. رێگە بۆ کاندیدکردنی ئۆکرانیا بۆ هاتنەپاڵ یەکێتی ئەوروپا خۆشبکات. لە ٢٣ی حوزەیرانی ٢٠٢٢. پەرلەمانی ئەوروپا پشتی بە بڕیارێک بەست کە داوا دەکات. دەستبەجێ رەوشی کاندیدی ئەندام بوون لە یەکێتی ئەوروپا ببەخشرێت بە ئۆکرانیا. لە



٢٣ی حوزەیرانی ٢٠٢٢ ئەنجومەنی ئەوروپا، ئۆکرانیای کردە کاندید بۆ چوونە پاڵ یەکێتی ئەوروپا.

## تێڕوانینێک بۆ ململانێکان

وڵاتانی ئەوروپا و بە تایبەت وڵاتانی خۆرهەڵاتی کیشوەرەکە، ترسی ئەوەیان هەیە رووسیا لە دوای سەرکەوتنی لە ئۆکرانیا، هەژموونی خۆی بەسەر تەواوی ناوچەکەدا بکێشێت، بە تایبەت کە «یەکێتی ئۆراسیا» تا دێت پتەوتر دەبێت و کۆمارەکانی گورجستان و ئەرمینیاش بۆ چارەسەرکردنی کێشە ناوخۆیی و ئیقلیمییەکانیان پەنا بۆ کرملین دەبەن.

ئەوروپا هەروا بە ئاسانی ناتوانێت دەستبەرداری وزەی رووسی ببێت، ئەمەش لەڕێی دەرکەوتنی کاریگەریی سەپاندنی سزاکانەوە بەڕوونی دەرکەوتووە، لە کاتێکدا ئابووری رووسی تادێت بەهێزتر دەبێت و هەنگاوە سەربازییەکانیشی وێڕای خاوبوونەوە، لە بەرژەوەندی سیاسەتەکانی دەشکێنەوە.

سەرکەوتنی رووسیا لە ئۆکرانیا گەر بێتەدی، هەر تەنیا سەرکەوتن نییە بەسەر کۆمارێکی پێشووی یەکێتیی سۆڤییەت و جڵەوکردنەوەی یاخیبوویەکی روو لە خۆرئاوا، بەڵکو سەرکەوتنە بەسەر تەواوی خۆرئاوا بە ویلایەتە یەکگرتووەکانیش کە خەریکە پشت لە پرەنسیپی تاک جەمسەری و دابەشکردنی رۆڵەکان دەکات لە جیهاندا.

پێناچێت لەمجارەدا رووسەکان هەڵەی پێشینەکانیان لە «یەکێتی سۆڤیەت» دووبارە بکەنەوە، بۆیە وردتر مامەڵە دەکەن و لە بری کەوتنەوە نێو جەنگێکی سارد، رووبەڕووبوونەوەی راستەوخۆ هەڵدەبژێرن، لەڕێی هەڕەشەی بەکارهێنانی چەکی ئەتۆمیش «بەرگری لە ئاسایشی نەتەوەیی بوون و مانەوەی رووسیای فیدراڵ» دەکەن کە پێیانوایە لەوانی تر لەپێشترن بۆ سەرکردایەتیکردنی جیهان.




# فەرهەنگی زاراوەی سیاسی

## ڕاست ڕەو و چەپ ڕەو

بەشی هەرە زۆرمان زاراوەی ڕاست ڕەوو چەپ ڕەومان لە نێو دنیای سیاسەتدا بیستوەو کەم تا زۆرێکیش زانیاریمان دەربارەی واتاکەی هەیە.

بەڵام بەشێکی کەم لە خوێنەران شارەزاییان دەربارەی ڕەگ و ڕیشەی ووشەکە هەیەو نازانن بۆچی بە هەڵگرانی ڕێبازێکی فیکری سیاسی دەوترێت ڕاسترەوو، بەوی تریان دەوترێت چەپڕەو. ئایا ئەم ووشەی ڕاست و چەپە لەچیەوە هاتوە.

ڕاست و چەپ دوو دەربڕینی سیاسین کە لە ڕووی مێژووییەوە دەگەڕێتەوە بۆ پێگە یان پێگەی پەرلەمانتاران لە پێوەندی لەگەڵ پێگەی سەرۆکی پەرلەمان. بنەماکەی ئەوەیە کە دەربڕینی ڕاست و چەپ دەربڕینێکی کاتییە کە... لەگەڵ گۆڕینی دۆخی دانیشتن دەگۆڕێت. چونکە ڕەنگە چەپی دوێنێ ببێتە ڕاستی ئەمڕۆ و بە پێچەوانەشەوە. بەڵام لە فەرهەنگی سیاسیدا هەتا ڕادەیەکی زۆر دوو بنەمای چەسپیون و زۆر جار مل دەکێشێت بۆ فەلسەفەو دنیابینیەکی ئایدیلۆجی و تا دەگاتە ڕادەی بە پیرۆزکردن.





بەڵام پێش ئەوەی بێینە سەرباسی مێژووی سەرهەڵدانی ئەم زاراوەیەو ڕەگی ووشەکە . با کورتەیەک لەسەر مانای هەردوو زاراوەکە بخەینە ڕوو:

## چەپ ڕەو

چەپ یان پارتی چەپ ڕەو بەهەڵگرانی ئەو ڕێبازە سیاسیە دەووترێت کە خوازیاری دابەشکردنێکی عادیلانەی داهات و درووست کردنی کۆمەڵگایەکی یەکسان و بوونی عەدالەتی کۆمەڵایەتی و کەمکردنەوەی جیاوازی چینایەتین. چەپگەرایی زاراوەیەکە کە نوێنەرایەتی ڕەوت و فیکرێکی سیاسی دەکات و هەوڵدەدات کۆمەڵگا بگۆڕێت بۆ دەوڵەتێکی یەکسانتر لە نێوان ئەندامەکانیدا. زیاتر چەپەکان مەیلیان بەلای بیری سۆشیالیستیدا هەیەو لە مێژوودا بەمارکسی و سۆشیالیستە کان ووتراوە چەپڕەو.

بە تێپەڕبوونی کات. بەکارهێنانی دەستەواژەی «چەپگەرایی» گۆڕان و لێک جیابوونەوەی تیا دروست بووە. لە وولاتانی ڕۆژ ئاوا و ئەوروپا بە فیکری سۆشیال دیموکرات و سۆشیالیزمی دیموکراتی و لیبراڵیزم و لیبراڵیزمی کۆمەلایەتی دەوترێت چەپ. بەلام پەیڕەوانی فیکری سۆشیالیزمی زانستی فەلسەفەی مارکسیزم لینینیزم بە ڕیبازی ڕاستەقینەی چەپ بوون دەزانن و ئەوانەی تر بە لادەر( انحرافی) لە قەڵەم دەدەن. لە بنەڕەتدا ڕێبازی چەپگەرایی مارکسیزم لە سەر سێ کۆڵەکەی ئەنترۆپۆلۆژیای فەلسەفی و. تیۆری مێژوو. بەرنامەیەکی ئابووری سیاسی داڕێژراوە.



## ڕاست ڕەو

کەسە ڕاست ڕەوەکان یان پارت و بزووتنەوە ڕاست ڕەوەکان . بەهەڵگرانی ئەو ڕێبازە سیاسیە دەوترێت کە کەمتر خۆیان لەقەرەی گۆڕانکاری بنچینەیی دەدەن و هەوڵ دەدەن سیستەمە کۆنەکان وەکو خۆیان بمێننەوە. بەلام چاکسازیان تێدا بکرێت و جوانکاریان بۆ بکرێت و هەوڵی گۆڕینی بنچینەیی لە پەیوەندیە چینایەتی و ئابوریەکان نادەن. هەروەها هەڵگرانی ئەم تێزە لە سیاسەت کردن زۆرجار داوای دەستوەردان لە ژیانی کۆمەڵگادا دەکەن بۆ پاراستنی نەریتی کۆمەڵگا. بە پێچەوانەی بزووتنەوەی چەپ کە داوای سەپاندنی یەکسانی لە نێوان ئەندامانی هەمان کۆمەڵگادا دەکات. هەروەها پارتە ڕاست ڕەوەکان داوای بەهێزکردن و پتەوکردنی هەیکەلی سیستمی ئێستا دەکەن. پێچەوانەی باڵە چەپەکان کە داوای گۆڕانکاری ریشەیی دەکەن. بۆ یاسا و ڕێساکانی دەوڵەت و کۆمەڵگا.

هەڵگرانی بیری ڕاست ڕەوی لە ڕووی کۆمەڵایەتی و ئابووریەوە: باوەڕیان بە نایەکسانی نێوان مرۆڤەکان هەیە. نەک نایەکسانی لە تواناکان. بەڵکو نایەکسانی ئابووری و کۆمەڵایەتی. و دەڵێن ئەم نایەکسانییە شتێکی سروشتییە و تەنانەت ئایینەکانیش پشتیوانی ئەم نایەکسانییە دەکەن.

## ناوی چەپ و ڕاست لە چیەوە هاتوە؟

ساڵی ١٧٨٩ لەسەرو بەندی شۆڕشی فەرەنسادا ئەندامانی پەرلەمانی ئەو وولاتە لەسەر داهاتوی سیاسی وولاتەکەیان بوونە دووبەشەوە. لە کۆبونەوەیەکی پەرلەماندا بۆ ساغکردنەوەی ئەو بابەتەی کە سیستەمی پاشایەتی لەفەرەنسادا هەر وەکو خۆی بەتەواوی دەسەڵاتەکانیەوە بمێنێتەوە. بەڵام پاشا گۆڕانکاری لە بەڕێوەبردنی دەسەڵاتدا بکات. یان سیستەمی پاشایەتی لە بنچینەوە هەڵتەکێنرێ و سیستەمێکی پێشکەوتو جێگەی بگرێتەوە.

بۆ دەنگدان لەسەر ئەو بابەتە. ئەوانەی خوازیار بوون کە پاشا بەتەواوی دەسەڵاتەکانیەوە بمێنێتەوەو گۆڕانکاری بنچینەیی لە سیستەمی دەسەڵاتدا نەکرێت. چوونە لای ڕاستی سەرۆکی پەرلەمانەوە وەستان. ئەوانەشی کە خوازیار بوون سیستەمی سیاسی وولات لە بنچینەوە بگۆڕێت. چوونە لای دەستی چەپی سەرۆکی پەرلەمانەوە وەستان. ئیتر لەو مێژووە بەدواوە. ووشەی ڕاست و چەپ بوو بە ناسنامەی ئەو دوو ڕێبازە سیاسیە جیاوازەی کە ئێستا بە ڕاست ڕەوو چەپ ڕەو ناسراون.

سەرچاوە:


* فەرهەنگی زانستی سیاسی. دانراوی ئەحمەد شەبانی.دانشگاهی کوردستان.سنە
* مجتمع لازم تفهم.مدونة عربية مصرية
* وێب سایتی الموضوع
* مرکز النبأ الوثائقي
* ماڵپەڕی( اطلس المعرفه)

مختەران محەمەد

# ڕۆڵی هەتیو لە مێژوودا

## هەتیو وەک ئەدیب

ئەگەر ئەدەب هونەرێک بێت لە هونەرە جوانەکان و ڕەنگدانەوەی دیمەنێک بێت لە دیمەنەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی! یان وێنەیەک بێت دەربارەی واقیعی کۆمەڵایەتی بە تەواوی ڕەهەندە جیاوازەکانی وەک سایکۆلۆجی و فیکریی و ماددیی و ...تاد! یان ئەو ڕۆشناییە بێت کە تیشکەکانی دەخرێتە سەر ناڵاندنێکی دیاریکراو و سەرنجی کۆمەڵی بۆ ڕادەکێشرێت و دواتر چارەسەرە ڕیشەییەکانی بۆ دەدۆزرێتەوە! یان ئەگەر ئەدەب ئاوێنەیەک بێت، بۆ هەموو ئەو گۆڕانکارییانەی لە کۆمەڵگەدا دروست دەبن و ڕەنگدانەی کێشە زیندووەکانی کۆمەڵ بێت! ئەوا ڕەنگە کەسایەتی منداڵێکی هەتیووی بێبەش لە سۆز و خۆشەویستی، چاودێری و سەرپەرشتیکردن، گرنگپێدان و ...تاد، لە تەواوی مرۆڤەکانی تر باشتر واقیع و ڕاستییەکان وەک خۆیان ببینێت! هاوکات لەلایەکەوە ئەگەر تاڵاوی ژیان و نەهامەتییەکان و

خەمەکانی ڕۆژگار ڕۆڵێکی گرنگ لە دروستبوون و پێگەیاندنی کەسێتیی ئەدیبدا ببینن! ئەوا ڕەنگە لەمەشدا هەتیووەکان هەر پشکی شێریبان بەربکەوێت، چونکە هەر لە قۆناغێکی سەرەتایی ژیانییانەوە شان دەدەنە بەر قورساییەکانی ژیان و لەگەڵ نەهامەتییەکاندا هاوڕێیەتی پەیدا دەکەن! لەلایەکی تریشەوە ئەگەر خۆشەویستی ڕۆڵی گرنگ لە دروستبوونی ئەدیبدا بگێڕێت، ئەوا بەهەمانشێوە کەسێتیی هەتیوو هەر زوو لەو خۆشەویستییە بێبەش دەبێت و دەیەوێت، بەهەرشێوەیەک بوویێت، بەدەستیبهێنێتەوە! ئەمە لەکاتێکدا زۆر بەڕوونی و بێ پەردە بەهەموو ئەو دڵڕەقییانە ئاشنا دەبێت، کە (کۆمەڵ) بێ دەمامک بەرانبەریان ئەنجامی دەدەن! واتە ڕەنگە زیادەڕەوی نەکەین – بەشێوەیەکی گشتی نەک ڕەها- ئەگەر بڵێین زەمینەکانی بوونە ئەدیب لە پانتایی هەتیووێتیدا لە هەموو پانتاییەکانی تر باشتر گەشە دەکات! یان دەتوانیین بڵێین ئەو ئەدیبەی بەهەتیوێتی گەورە دەبێت، لە ڕووی (وردبی) و (قوڵیی) و (ئاست) و ...تاد، لەو ئەدیبانە پێگەیشتووتر دەبن کە هەتیوو نەبوون!



## ١- جاحظ
## ئینسایکلۆپیدیای سەردەمی خۆی:

ناوی تەواوی ئەبو عوسمان (عەمرو ئیبن بەحر ئەلجاحظ)ە. لە ساڵی (159ک) لە بەسرە و بە هەتیوویی و هەژاریی لەدایک بوو. هاوکات زۆرینەی خەڵکی بە نازناوی (ناشرین) بانگیان دەکرد! بەڵام ڕۆح سوک و قسەخۆش بوو و حەزێکی زۆری لە گاڵتە و گەپ دەکرد. هەر لە منداڵییەوە حەزی بە فێربوونی زانست کرد و قورئان و لەبەرکردنی و ڕێزمانی زمانی عەرەبی

لای مامۆستاکانی ناوچەکەی خۆی فێربوو. بەڵام بەهۆی هەژارییەکەیەوە نەیتوانی خۆی بۆ خوێندن تەرخان بکات. بۆیە بە ڕۆژ دەست بە نان و ماسی فرۆشتن دەکات و بە شەویش دەچوو بۆلای ئەو کەسانەی کە کتێبییان هەیە تا بخوێنێتەوە! بۆیە هەر لە منداڵییەوە ئاگادارییەکی باشی دەربارەی ڕۆشنبیری فارسی و یۆنانی و هندی هەبوو! تەنانەت زۆرجار لەگەڵ خودی وەرگێڕی ئەو کتێبانەدا دەکەوتە گفتووگۆوە!

سەرەتا لای (الاصمعی) و ئەبو عوبەیدە و ئەبو زەیدی ئەنساری زمان و ئەدەبی عەرەبی دەخوێنێت. لەسەر دەستی ئەخفەش (الاخفش) یش نەحو دەخوێنێت. لای هەردوو زانا ( ئیبراهیم بن سەیار بن هانی الناظم البصری زانستی کەلام دەخوێنێت. (من هو جاحظ اراجیز) ئەو حەزێکی لە ئەندازەبەدەری بۆ خویندنەوە هەبوو. بۆ نموونە (یاقوتی حەمەوی) لە (ئەبی هەفان) ەوە کە هاوسەردەمی جاحظ بووە. دەگێڕێتەوە کە گوتوویەتی:" هەرگیز نە بیستوومە و نە کەسێکم بینیوە وەک جاحظ کتێب و زانستەکانی خۆشویستبێت. ئەو هەر کتێبێکی



بەردەسـت کەوتبێـت، هەرچۆنێـک بوو‌بێـت، خوێندوویەتییـەوە، بۆیـە نامـۆ نییـە لـە نووسـینەکانیدا چەندەهـا بەشـی بـۆ کتێـب و سـوود و زیانەکانـی تەرخـان کـردووە".

دواتـر بـە ناوی(الجاحـظ)ەوە دەناسـرێت، کـە واتـای (چـاو هەڵتۆقیـو) دەگەیەنیت! ئەمـەش لەبـەر ئـەوەی چاوەکانـی هەڵتۆقیوبـوون و خـۆی ئـەم نازنـاوەی پێناخـۆش بـوو و داوای لـە خەڵکـی دەکـرد بەنـاوی خۆیـەوە (عەمـرو) یـان (ئەبـو عوسـمان) بانگـی بکـەن، بۆیـە تـا پیریـش بـوو ڕقـی لـەم نازنـاوە بـوو! بـەڵام کـە تێبینـی ئـەوەی کـرد، خەڵکێکـی زۆر لـە جیهانـی سـەردەمی خۆیـدا بـەم نـاوەوە دەیناسـن و بەشـێکی زۆریـان نـاوە ڕاسـتەقینەکەی نازانـن! بۆیـە خـۆی بەدەسـتەوە دا و دواتـر خـۆی بـە (جاحـظ) ناسـاند!

جاحـظ بەیەکێـک لەدیارتریـن ئەدیبەکانـی سـەردەمی عەباسـی دادەنرێـت، کاریگەرییەکـی گـەورەی لەسـەر ڕۆشـنبیری عەرەبـی و ئیسـلامی جێهێشـت، تیکەڵێکـی گەورەبـوو لـە وزە زانسـتی و هونەرییـەکان، کـە دونیـای پـڕ پـڕ کـرد و خەڵکـی بـە بەهـرە و لێهاتووییەکانییـەوە سـەرقاڵ کـرد! ئـەو عەقڵەکانـی دەکـرەوە و چێـژی بـە گوێیـەکان دەبەخشـی و خەمـی دڵەکانـی بەبـادەدا!

ئـەو زۆر لێهاتووانـە بـۆ چارەسـەرکردنی کێشـە و ناکۆکـی و ململانێـکان بـرەوی بـە پەیڤیـن و گفتوگۆکـردن دەدا! ئەمـەش لـە زۆرینـەی کتێبەکانیـدا بەرچـاو دەکـەوێـت، تەنانـەت نزیکـەی بـەرگ و نیوێکـی کتێبـی (الحیـوان) بریتییـە لـە پەیڤینـی خـاوەن سـەگ و خـاوەن کەڵەشـێرێک! ئـەم پەیڤینـەش بـۆ گوزارشـتکردن لـەو دوژمنایەتییـە بوو، کـە لەنێـوان هـەردوو ڕەوتـی عەرەبێتـی و شـعوبێتی! لـە ئـارادا بـوو! بۆیـە دوو ناویشـی لـە گـەورە زاناکانـی زانسـتی کـەلام هێنابـوو، ئەوانیـش (ئەبـو ئیسـحاق ئەلنظـام) و (معبـد) بـوون، وایلێکردبـوون یەکێکیـان بەرگـری لـە سـەگ و ئەویتریشـیان لـە کەڵەشـێر بـکات، بـۆ ئەمـەش ڕاکانیانـی هێنابـوو! تەنانـەت کەسـێکی وەک تەوحیـدی لـە (پەیڤیـن) دا چـاوی لـە جاحـظ کردبـوو، هـاوکات دەیگـوت" ئەگـەر بـە قوڵـی لـە کاروبـاری مرۆڤـەکان وردببیتـەوە، ئـەوا دەبینیـت ئەوکەسـانەی کـە گرنگییەکـی زۆر بـە هەڵـەی کەسـانی تـر دەدەن، ئەوانـە خۆیـان نەنگییەکانیـان زیاتـرە!"

ئـەو لـە ڕووی فکرییـەوە موعتەزیلـە



جاحظ بەرهەمگەلێکی
زۆری پاش خۆی
بەجێهێشت، کە
دەگوترێت زیاتر لە (370)
کتێب بووە! زۆرینەیان
دەسنووسن و تا ئێستاش
چاپ نەکراون.

بــوو، واتــە عەقڵــی لەســەرو هەمــوو شــتێکەوە دادەنــا و بــە جیاکــەرەوەی نێــوان پرســەکانی دادەنــا! هــاوکات بڕوایەکــی پتــەوی بــە (گومــان) وەک ڕێگەیــەک بــۆ گەیشــتنە یەقیــن هەبــوو. ئــەو کەســێک بــوو کــە دارای مەعریفەیەکــی فــراوان بــوو.

بــە هەمانشــێوە ئەدیبێکــی بلیمــەت و زانایەکــی بــواری زانســتی کــەلام و ڕۆچــوو لــە مێــژوو و فەلســەفەدا بــوو! هــاوکات گرنگیشــی بــە زیندەوارزانــی و ڕووەکناســی دەدا!

جاحــظ بەرهەمگەلێکــی زۆری پــاش خــۆی بەجێهێشــت، کــە دەگوترێــت زیاتــر لــە (370) کتێــب بــووە! زۆرینەیــان دەسنووســن و تــا ئێســتاش چــاپ نەکــراون، لــە بەناوبانگتریــن کتێبەکانیشــی بریتیــن لــە: (البیــان التبیــن) لــە چــوار بەرگــدا و ( کتــاب الحیــوان) لــە هەشــت بەرگــدا و (البخــلاء) و (المحاســن و الاضــداد) و (البرصــان و العرجــان) و (التــاج فــی اخــلاق الملــوک) و (الامــل و المامــول) و (التبصــرة فــی التجــارة) و (البغــال) و ( فضــل الســودان علــی البیضــان) و رســائل الجاحــظ).

لــە کۆتاییەکانــی تەمەنیــدا نەخۆشــی تەنگــی پێهەڵچنــی و تووشــی نیــوە ئیفلیجبوونێــک بــوو، بــەلام ئــەوە هــۆکاری مردنەکــەی نەبــوو! بەڵکــو زانســتەکەی هــۆکارە ڕاســتەوخۆکە بــوو! ئەوەبــوو ڕۆژێــک لــە ڕۆژەکانــی مانگــی موحەڕەمــی ســاڵی (255ک) کــە بەتەنهــا و بــە خشــکەیی بەنــاو کتێبەکانیــدا کــە لەســەر یــەک هەڵچنرابــوون، دەگــەڕا و کتێبــە قــەوارە گەورەکانــی بەســەریدا ڕوخــان و گیانــی لەدەســت دا!

لــە کۆتاییــدا دەتوانیــن بڵێیــن گــەر بمانەوێــت پــەی بــە مــرۆڤ ببەیــن، ئــەوا نووســینەکانی جاحــظ زۆر بەروونــی و بــێ پــەردە وێنــە جیــاواز و جۆراوجۆرەکانیمــان پێشــکەش دەکات!



# بیرەوەریەکانی مستەر همفر



بەشی کۆتایی

بەرزان عەباس بەدری

## چەند فەرمانێکی نهێنی بەمەبەستی وێرانکردنی ئیسلام

بەرپرسی ئەو دەزگایەی کە کارم بۆ دەکردن نهێنیەکی دیکەی بۆخستمە ڕوو. ئەمەش تەواو دوای ئەوەهات کاتێک سەرەنجی ئەوەی دابوو کە دوای ئاشکراکردنی نهێنی یەکەم زۆر بەتاسەوە چاوەڕێی ئەوەبووم ئەم نهێنیەشم بۆ ئاشکرا بکات. نهێنی دووەم نوسراوێکی ورد و دەتوانم بڵێم وەک دۆکۆمێنتێک بوو. خۆی لە پەنجا لاپەڕەدا دەبینیەوە. لەو نوسینانەدا بە وردی باس لەو ڕێکار و پلانانە کراوە کەمەبەست لێی وێران کردن و پارچە پارچە کردنی ئیسلام و مسوڵمانانە لەماوەی یەک سەدەدا. مەبەست لەم پلانانە ئەوەیە تاکو چیتر ئیسلام گرنگیەکی ئەوتۆی نەمێنێت وەک هەرسەردەمێکی ئاسایی باسی لێوە بکرێت. ئەو نەخشە ڕێگایەی کە بەرپرسەکەم پیشانی منی دا بەهەمان شێوە بۆ بەرپرسانی باڵای تایبەتمەند بەم کەیسەی ناردبوو بۆ ئەوەی کاری لەسەر بکەن. گرنگترین ئەوبابەتانەی کە پێویستە بەوپەڕی نهێنیەوە کاری لەسەر بکرێت و نابێت بە هیچ شێوەیەک دزەی پێ بکرێت بۆناو مسوڵمانان خۆی لە چواردە بەند و بڕگەدا دەبینیەوە کە ئەمانەن

١-هەماهەنگیەکی باش لەگەڵ قەیسەرەکانی (ڕوسیا) بەمەبەستی دەستگرتن بەسەر ئەو ناوچەو شارانەی کەدەکەوێتە ژێر هەژموونی ئیسلامەوە وەک (بوخارا، تاجیکستان، ئەرمینیا، خراسان،هتد...) بەم



شێوەیە ئەو ناوچانەی دەکەوێتە نێوان عوسمانیەکان و ڕوسیا دەکەوێتە ژێر هەژموونی خۆمان.

٢-هەماهەنگیەکی تۆکمە وبەهێز لەنێوان فەڕەنسا و ڕوسیا دروست بکەین. مەبەست لەم هەماهەنگیە داڕشتنی پلانێکی ورد بێت بۆ وێرانکردنی ئیسلام لە ناوەوە و دەرەوەدا

٣-دروستکردنی پشێوی و ئاژاوە لەنێوان هەردوو دەسەڵاتی عوسمانی و سەفەوی. ئەوەش لەڕێگەی خۆشکردنی ئاگری تایفی و دەمارگیری لەنێوان هەردوولادا. هەروەها ئاشوب نانەوە لەنێوان ئەو هۆزو تیرانەی کەدراوسێی یەکترن. بەهەمان شێوە دروستکردنی دوو بەرەکی لەنێوان ئەو نەتەوانەی لە ژێر چەتری ئیسلامدا دەژین وەهەروەها زیندوو کردنەوەی ئەو مەزهەب و بیرو بۆچونە کۆنانەی کەپێشتر کاریان لەسەر کردووە.

٤-کارکردن لەسەر دابەشکردنی هەندێک ناوچە کە لەژێر دەسەڵاتی ئیسلامدایە بەو کەس و لایەنانەی کە مسوڵمان نین. بۆ نمونە (یەسریب) بدرێت بە (جووەکان). (ئەسکەندەریە) بدرێت بە (کریستیانەکان). (یەزید) بدرێتر بە (زەردەشتیەکان). (عەمارە) بدرێت بە (سائیبەکان). (کرمانشاە) بۆ (کاکەییەکان). (موسڵ) بۆ (یەزیدیەکان). (کەنداوی فارس-عەرەب) بۆ (هیندەکان) دوای ئەوە ژمارەیەکی زۆر خێزان و

بڵاوکردنەوەی گەندەڵی و بێ ڕەوشتی لەنێوان مسوڵمانان، ئەویش لەڕێگەی بڵاوکردنەوەی دیاردەی (زینا) و (هاوڕەگەزبازی) و خواردنەوەی مادە کحولیەکان، قومار، ئەمەش بەوکەسانە دەکرێت کە پێشتر لەم ناوچانەدا ژیاون و هەڵگری ئەو ئاینانەی کە پێش هاتنی ئیسلام ڕۆڵ و دەسەڵاتیان هەبووە و ئەبێت بەشێوەیەکی بەرچاو هاوکاری بکرێن.

هاوڵاتی هیندی دەهێنرێت بۆ ناوچەکە. هەروەها (تەرابلوس) بۆ(درووزەکان) (فارس) بۆ (عەلەویەکان) .(مەسقەت) بۆ(خەواریجەکان)!! پێویستە بە وردیش کار لەسەر ئەم چین و توێژانە بکرێت و لەهەمان کاتدا لەڕوی دارای و چەک و پلاندانان و شارەزاییەکانمان هاوکاریان بکەین لەکۆتایشدا دەبن بە هۆکارێکی کاریگەر و سەرەکی بۆ ڕوخاندنی ئیسلام. ئەمەش دوای ئەوەی ناوچەی دەسەڵاتیان فراوان دەبێت.

٥-پلان دانان بۆ بڵاوکردنەوەی پروپاگەندە لەوناوچانەی لەژێر دەسەڵاتی هەردوو دەسەڵاتی عوسمانی و سەفەوی بەمەبەستی دروستکردنی چەندین دەسەڵات و حکومەتی خۆجێیی. بەهەمان شێوەی کە لەهندستان هەیە.

٦-دروستکردنی چەند ڕەوتێک و بیروڕا بەناوی ڕیفۆرم و نوێگەری لەجەستەی دەسەڵاتی ئیسلامی. بەشێوەیەک لەگەڵ هزر و بیری کەسانی عەوامدا بگونجێت. بۆنمونە دروستکردنی چەندین ڕەوت بەناوی نوێگەری لەو ناوچانەی لەژێر دەسەڵاتی شیعەکاندایە. ڕەوتێک بۆ لایەنگرانی (حسێن کوڕی عەلی). لەلایەکی ترەوە بۆ لایەنگرانی (جەعفەر سادق). باوەڕدارانی دەرکەوتنەوەی (مەهدی). بەهەمان شێوە لایەنگرانی (عەلی ڕەزا) کەیەکێکە لە ئیمامە خۆشەویستەکان لەلای شیعە مەزهەبەکان. لەهەمان کاتدا بەپیرۆز

کردنی ئەو ناوچانەی کە تیایدا نێژراون. حسێن لە (کەربەلا)، جەعفەر لە (ئەسفەهان)، مەهدی لە (سامەڕا)، عەلی ڕەزا لە (خوراسان). سەبارەت بە چوار مەزهەبەکەی سوننە دەبێت بە شێوەیەک کاریان لەسەر بکرێت، هەریەکیان خۆی بە شایستە تر بزانێت لەوی تر. هەروەها کار لەسەر ئەوە بکرێت دووبەرەکی لەنێوانیان دروست بکرێت هەتا ئەو ئاستەی خوێنی یەکتر بڕێژن. لەلایەکی ترەوە کاریکرێتە سەر گومانکردن لە هەر نوسین و فەتوایەک کەلەلایەن هەریەکیانەوە دەربچێت. هەتا ئەو ئاستەی هەر لایەنێک ئەوی تر بە گومڕا و کافر ناوزەند بکات شەرعیەت بە پاکتاوکردنی یەکتر بدەن.

٧-بڵاوکردنەوەی گەندەڵی و بێ ڕەوشتی لەنێوان مسوڵمانان، ئەویش لەڕێگەی بڵاوکردنەوەی دیاردەی (زینا) و (هاوڕەگەز بازی) و خواردنەوەی مادە کحولیەکان، قومار، ئەمەش بەوکەسانە دەکرێت کە پێشتر لەم ناوچانەدا ژیاون و هەڵگری ئەو ئاینانەی کە پێش هاتنی ئیسلام ڕۆڵ و دەسەڵاتیان هەبووە و ئەبێت بەشێوەیەکی بەرچاو هاوکاری بکرێن.

٨-دروستکردن و دانانی کەسانی گەندەڵ و بێ ئەزموون لەسەر کورسی دەسەڵات، بەتایبەتی ئەو کەسانەی نزیکن لەدەزگاکەمان و دەتوانرێت بە ئاسانی ئەو مەرام و پلانانەی دایدەڕێژین بۆمانی جێ بەجێ بکات. ئەگەر توانراش ئەو کەسانەی بەڕواڵەت مسوڵمانن و لە ناخەوە هیچ سۆزێکیان بۆ ئیسلام نیە بتوانین کاریگەریان لەسەر دروست بکەین بەهەمان شێوە دەتوانین بە زۆربەی ئامانجەکانمان بگەین!

٩-ڕێگری کردن لە بڵاوبونەوەی زمانی عەرەبی بەپێی تایبەت مەندی هەر ناوچەیەک و کارکردن لەسەر مانەوەو فراوانکردنی ئەو زمانانەی کە ناعەرەبین، بۆ نمونە (سانس کرێتی، فارسی ، کوردی، پشتوو، هتد...) لەهەمانکاتدا زیندووکردنەوەی ئەو زمان و دیالێکتانەی کە بەزەبری هێز خەریکە لەناو دەبرێن. هەروەها کاریکرێت بۆ دابڕینی عەرەبی زمانەکان لە زمانە ڕەوانەکەیان کە ئەویش زمانی (قورئان)ە.

١٠-ڕواندنی کەسانی نزیک لەخۆمان لەچواردەوری دەسەڵاتداران و گەیاندنیان بە پلەی ڕاوێژکار بۆیان. لەم ڕێگەیەشەوە دەزگاکەمان دەتوانێت ئاگاداری هەموو وردەکاریەک بێت کە دەگوزەرێت. لەلایەکی ترەوە پێویستە سوود لەو کۆیلەو کەنیزەکانە وەر بگیرێت کە نزیکن لە دەسەڵاتدارانەوە. بەتایبەت ئەوانەی بەهرەدارن و زیرەکن. هەروەها پێویستیشە لەلایەن دەزگاکەمانەوە بەوردی مەشقیان پێ بکریت و نزیکتریان بکەینەوە لەدەسەڵاتداران و منداڵەکان و هاوسەرەکانیان. بەم شێوەیە بەرە



بـەرە دەسـەڵاتداران بەشـێوەیەکبن لەژێـر هەژمـوون و بیروڕاکانیـان لابـدەن و وەک بازنێـک بـن لەدەسـتدا.

١١-فراوانکردنـی بیـروڕای ئاینـی کریسـتیانی لـە سـەرجەم جومگوکانـدا. بەتایبـەت لـە نێو ژمێریـاران و پزیشـکان و ئەندازیاران. هەتا ئـەو ئاسـتەی خۆیـان داوابکـەن کڵێسـاو ناوەنـدی خوێنـدن بـۆ کریسـتیانەکان دروسـت بکرێـت. هەروەهـا دامەزرانـدن و دروسـتکردنی ڕێکخـراوی خێرخـوازی بەشـێوەیەکی بەرفـراوان لـەو ناوچانـەی کـە ئیسـلام دەسـەڵاتدارە. لەلایەکـی تریـش کارکـردن لەسـەر بڵاوکردنـەوەی ئـەو کتێبانـەی کـە بـاس لەچاکـە و ئامـۆژگاری مەسـیح دەکات بەشـێوەی بـێ بەرامبـەر و گرنگیـدان بەمێـژووی مەسـیحیەکان و مسـوڵمانان. ڕواندنـی سـبخوڕ لـە نـاو پەرستگاکان بەنـاوی پیاوی ئاینـی و ڕاهیبات بەمەبەسـتی ئاسـانکاری جموجوڵـی کریسـتیانەکان بـۆ ئـەوەی چاودێـری هاتوچـۆی مسـوڵمانکان و بارودۆخیـان بـن. پێویستیشـە (سـوپا)یەک دروسـت بکریـت بـۆ شـێواندنی مێـژووی مسـوڵمانان و بـێ نـرخ کردنـی کتێبەکانیـان.

١٢-دروسـتکردنی گومـان لـەلای گـەنجانـی کـچ وکـوڕی موسـوڵمان بەشـێوەیەک گومـان بکـەن لـە ئاینەکەیـان وتێکدانـی داب ونەریتیـان لەڕێگـەی خوێندنگاکانیانـەوە وبڵاوکردنـەوەی کتێبـی نامـۆ بـە کۆمـەڵ وکردنـەوەی (یانە)لەلایـەن ئەوهاوڕێیانەیـان

ڕووخاندنی (کەعبە)بەناوی ئەوەی بۆتە جێگەی(شیرك) بۆخودا دروستکردن نەك پەرستنی خودا ،لەلایەکی دیکەوە خەڵك بترسێنن بەوەی ئەگەر بێت وسەردانی مللە بکەن لەلایەن هۆزەکانی نزیك ئەوناوچەیە هێرشدەکرێتە سەریان ودوای ئەوەی شتومەکەکانتان بەتالان دەبەن دەشتان کوژن .

کەموسوڵمان نین .هەروەهابابەتێکی گرنگی تر هەیە پێویستە کاری لەسەر بکرێت .ئەویش دروستکردنی چەند ڕێخراوێک کە بەنهێنی لەلایەن گەنجانی جوویان کرستیان سەرپەرشتی بکرێت بەمەبەستی فریودان وبەلاڕێدابردنی گەنجانی موسوڵمان بەهەمووشێوەیەک .

١٣-هەڵگرساندنی شەڕودووبەرەکی وشۆڕش لەناوخۆولەدەرەوەی سنوورەکان لەنێوان موسوڵمانان و ئەوانەی موسوڵمان نین .بەتایبەت کارکردن لەسەر تێکدانی تەبایی ویەکیەتی نێوان موسوڵمانان هەتائەوئاستەی بەتەواوی دەپوکێنەوە وبیر لەپێشکەوتن ویەکگرتووی نەکەنەوە .بەم شێوەیەش لەڕووی هزرو بیرکردنەوەی ئەرێنی زەبرێکی باشیان لێدەدرێت .لەڕووە داراییەکەشەوە ئەوەندەی ترمایە پوچ دەبن .بەم شێوەیە گەنجەکانیان وبەهرەدارەکانیان وولات بەجێ بهێڵن .ئەوەش دەبێتە فاکتەرێک بۆپشێوی وناسەقامگیری زیاتر لەنێوانیاندا.

١٤-وێرانکردن وڕوخاندنی هەمووسەرچاوە ئابوری ودارایەکان .لەوانە کشتوکاڵ وبژێوی ژیان وڕووخاندنی بەنداوەکان ووشک کردنی ڕووبارو سەرچاوە ئاویەکان .بڵاوکردنەوەی بۆ کاری ئەمەشیان ڕێگایەکی ترە بۆ دروستکردنی ناسەقامگیری .کارکردن لەسەرکردنەوەی ئەوشوێنانەی زیاتر سەرقاڵی بۆ کارەکان دەکات .هەتا ئەوئاستەی بەجۆرێک لەجۆرەکان ئەفیون



ومادده‌ی هۆشبه‌ری تێدا بفرۆشرێت ئه‌م چه‌ندخاڵه‌ی له‌سه‌ره‌وه ئاماژه‌مان پێدا به‌شێوه‌یه‌کی ورد ترو به‌شێوه‌ی نه‌خشه ودانانی وێنه‌ی هه‌ندێک له‌ناوچه‌کان خرابووه‌ناو به‌رنامه‌ی کاری ده‌زگاکه‌مانه‌وه.

سێیه‌مین گه‌شتم بۆعێراق

به‌م شێوه‌یه سپاسی به‌رپرسه‌که‌مم کرد بۆ ته‌واوی ئه‌وزانیاریانه‌ی که له‌رێگه‌ی ئه‌ونه‌خشه‌ودیکۆمێنتانه‌ی خستیه به‌رده‌ستم به‌مه‌به‌ستی ئه‌وه‌ی کاریان له‌سه‌ر بکه‌م وبه‌رچاوڕونتربم .له له‌نده‌ن نزیکه‌ی مانگێک مامه‌وه هه‌تا ئه‌وکاته‌ی فرمانمان له‌لایه‌ن ده‌زگاکه‌مانه‌وه پێکرا بۆ ئه‌وه‌ی بگه‌ڕێمه‌وه بۆ عێراق . به‌م شێوه‌یه به‌رده‌وام ده‌بین له‌قسه کردن ودانوستان له‌گه‌ڵ (محمد الوهاب).هه‌روه‌ها به‌رپرسه‌که‌م فه‌رمانی پێکردم هه‌مووهه‌وڵێک بخه‌مه‌گه‌ڕۆئه‌وه‌ی کاریگه‌ری له‌سه‌ر دروست بکه‌م .به‌وپێیه‌ی له‌چه‌ند سه‌رچاوه‌یه‌که‌وه زانیاری به‌ده‌ست گه‌یشتووه که‌شێخ باشترین که‌سه که‌پشتی پێ ببه‌سترێت بۆ به‌ده‌ست هێنانی ئامانجی ده‌زگاکه‌مان پاشان به‌رپرسه‌که‌م پێی وتم :

به‌ڕاشکاوی قسه له‌گه‌ڵ شێخ بکه .مه‌به‌ستی (محمد عبدالوهاب) بوو.له‌به‌رئه‌وه‌ی باوه‌ڕپێکراوێکی خۆمان که‌له (ئه‌سفه‌هان)ه .ئه‌ویش به‌ڕاشکاوی قسه‌ی له‌گه‌ڵدا کردووه وشێخ ڕه‌زامه‌ندی ده‌رېڕێوه .به‌مه‌رجێک ئێمه‌ش ژیانی بپارێزین وتوشی هیچ مه‌ترسیه‌ک نه‌بێت له‌لایه‌ن ده‌سه‌ڵات داران وپیاوانی ئاینی وئه‌وکه‌سانه‌ی که بیروڕایان له‌گه‌ڵدا ناگونجێت .به‌تایبه‌ت ئه‌وکاتانه‌ی به‌وپه‌ڕی ڕاشکاویه‌وه قسه‌ده‌کات .له‌لایه‌کی تریشه‌وه پشتگیریه‌کی سه‌ربازیشی بۆدابین بکرێت .هه‌تا ئه‌وسانه‌ی ئه‌گه‌ر بوار هه‌بێت (ئه‌ماره‌تێک)ی بچوکی له‌نزیک (نجده)وه بۆدروست بکه‌ین .له‌به‌رامبه‌ردا ده‌زگاکه‌مان هه‌مووئه‌و

مەرجانەی پێ قبووڵ بوو .ئەم قسانەی بەرپرسەکەم زۆر خۆشحاڵی کردم و نەمدەزانی چۆن گوزارشت لەوهەستە بکەم کە لەناخمدا فوڵپ دەخوات .لێم پرسی ...ئێستا فەرمانت چیە قوربان ؟داوا لەشێخ بکەم چیبکات ؟لەکوێوە دەست پێ بکەم ؟لەوەلامدا پێی وتم :بۆئەم مەبەستەش دەزگاکەمان پلانێکی وردی داڕشتوە بۆ ئەوەی شێخ ئەنجامی بدات .ئەوەش خۆی لەم خالآنەدادەبینێتەوە :

١-کارکردن لەسەر ئەوئامرازانەی کەوادەکات هەرموسوڵمانێک لەو (ئامۆژگاری)وقسانەی کە شێخ دەیکات دەربچێت بەکافر لەقەڵەم بدرێت ودەستبەجێ لەسێدارە بدرێت دەست بەسەرماڵ وموڵک و خێزانیدا بگیردێت وهەرزان بازاڕبکرێت .کوڕەکانیشیان مامەڵەی کۆیلە وکچەکانیشیان وەک کەنیزەک دەستبەسەربکرێن.

٢-رووخاندنی (کەعبە)بەناوی ئەوەی بۆتە جێگەی(شیرک)بۆخودا دروستکردن نەک پەرستنی خودا .لەلایەکی دیکەوە خەڵک بترسێنن بەوەی ئەگەر بێت وسەردانی مککە بکەن لەلایەن هۆزەکانی نزیک ئەوناوچەیە هێرشدەکرێتە سەریان ودوای ئەوەی شتومەکەکانتان بەتالان دەبەن دەشتان کوژن .

٣-هەوڵدان بۆ یاخی بوون لەدەسەلات وخەلیفە.هەتا ئەو ئاستەی گوشاریان لەسەر دروست بکەین و تەنانەت بەشێوازێک لە شێوازەکان پرچەکیان بکەین سوپایان

ڕوخاندنی زۆرترین مەزارو مزگەوت وئەو شوێنانەی لای موسوڵمانەکان پیرۆزە، ئیدی چ لەمەککە بێت یان مەدینە یان هەرناوچەیەک لەژێر هەژمونی موسوڵمانان ودەسەلاتەکایان بێت

بۆ دروست بکەین .هەروەها پێویستە بەرەنگاری (پیاوماقوڵانی حیجاز)بکەین . بەومەبەستەی هەژموونی دەسەڵاتیان کەم بکەینەوە ..

٤-ڕوخاندنی زۆرترین مەزارو مزگەوت وئەوشوێنانەی لای موسوڵمانەکان پیرۆزە، ئیدی چ لەمەککە بێت یان مەدینە یان هەرناوچەیەک لەژێر هەژمونی موسوڵمانان ودەسەڵاتەکایان بێت . بەوبیانووەی لەئێستادا ئەوشوێنانەی لەبری ئەوەی خوداپەرستی تێدا بکرێت بونەتە شوێنێک بۆدروستکردنی(شیرک-هاوبەش بۆ خودا) ئەمەش بێ ڕێزیە بە کەسایەتی و مێژووی پێغەمبەر و جێگرەوەکانی و هاوەڵەکانی .

٥-بڵاوکردنەوە ی پشێوی وکاری تیرۆرستی بەپێی تایبەتمەندی هەرناوچەیەک و دەسەڵاتێک .بەمەبەستی تێکدانی شیرازە و دروسکردنی دڵە ڕاوکێ.

چاپکردن وبڵاوکردنەوەی قورئان بەدەسکاریەوە. واتا زیادکردن ولابردنی هەندێک ئایەت.

پاشان بەرپرسی دەزگاکە جەختی لەبابەتێکی هەستیار کردەوەوپێی وتم ..ئەم نەخشەوپلانەی کەدامان ڕشتووە دەبێت هەمووبڕگەکانی و وردەکاریەکانی بەهەند وەربگیرێت .لەبەرئەوەی ئەم پرۆژەیە پرۆژەیەکی دوورمەودایە ونەوەکانی دوای ئێمە بەرەوی پێدەدەن .وەک ئاشکراشە لای هەمووان شانشینەکەمان وحوکومەتەکەمان بەوەناسراوە کەنەفەسیان درێژەو پەلەیان نییە بۆگەشتن بەو ئامانجانەی مەبەستمانە .هەروەهادەبێت کەسایەتی (محمد عبدالوهاب)بەشێوەیەک کاری لەسەر بکرێت کە هیچ کەمترنەبێت لە کەسایەتی (محمد)ی پێغەمبەر بەوشێوەیەش دەتوانین وەچەرخانێکی گەورەد رووست بکەین .

دوای ئەوەی ماڵئاوایم لە دەزگاکەمان وبەرپرسەکەمان وخانەوادە وهاوڕێکانم کرد توشی دڵتەنگیەکی سەیرهاتم .بەتایبەت لەکاتی چونەدەرەوە لەماڵەوە منداڵە بچوکەکەم پێی وتم باوکە تکایە زوو بگەڕێرەوە .خۆمم پێ نەگیراو چاوم پڕلە فرمێسک بوون وبەتوندی باوەشم بەهەردووکیاندا کردوو بەگەرمی ماچم کردن .بەم شێوەیە ملی ڕێگەم گرتەبەروبەرەو عێراق بەرێ کەوتم .دوای ماندوبیەکی زۆر گەشتمە (بەسرە)، کاتێک گەیشتمە بەسرە شە وبوو چووم بۆماڵی (عبد الرضا )لەوکاتەدا خەوتبوو .کاتێک منی بینی بەگەرمی پێشوازی لێ کردم .ئەوشەوە هەرلەوێ مامەوە بەیانی لەخەوهەستام پێی وتم :شێخ محمدعبدالوهاب پێش چەند ڕۆژێک گەڕاوەتەوە بۆبەسرە و نامەیەکی بۆجێ هێشتووم وداوای لێ کردوم بیدەم بەتۆ هەرهەمان ڕۆژیش بەسرەی بەجێ هێشتوە و نامەکەم خوێندەوە



باس لەوە دەکات کە بەرەو (نجد)بەڕێ کەوتووە وبۆماوەیەک لەوێ دەمێنێتەوە ،هەروەها ناونیشانی خۆی بۆنوسیوم بۆئەوەی هەرکاتێک بچم بۆ(نجد) لای ئەو بمێنمەوە منیش هەرهەمان ڕۆژ بەسەرەم بەرەو (نەجد) بەجێهێشت ودوای ماندووبونێک گەشتمە (نجد).دوای ئەوەی گەیشتمە نجد ڕاستەوخۆ چووم بۆماڵی (شێخ عبدالوهاب)، کاتێک بینیم توشی سەرسوڕمان بووم ،لەبەرئەوەی بەشێوەیەکی بەرچاو کێشی دابەزی بوو.دوایی پێمزانی هۆکاری ئەولاوازییەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەنجامدانی سێکسی زۆر بەبەردەوامی لەگەڵ خێزانەکەی ،هەربۆیە بەپێکەنینەوە پێموت تۆزێک کەمی بکەرەوە ،پێویست بوو جۆرە سینارۆیەک دابڕێژین بۆئەوە ماوەیەکی زۆر لە(نجد) ە بمێنمەوە لەهەمانکات دا سەرنجی خەڵک بەلای خۆمدا ڕانەکێشم ،بۆیە بەشێخم ووت ..هەرکەسێک پرسیاری منی لێ کردی پێیان بڵێ ئەم کۆیلەیەم لەبەسرە کڕیوە وئێستا هاتووە بۆئێرە بۆهاوکاریکردنم وخزمەت کردنم ،بەم شێوەیە بۆماوەی دووساڵ لەوێ مامەوە وهەموو ئامادەکاریەکمان کرد بۆ ئاشکراکردنی ئەوڕەوتەی ماوەی چەندین ساڵە ئامادەکاری بۆ دەکەین بەم شێوەیە هەتا ساڵی (١١٤٣) کۆچی بەردەوام بووین ،ئیدی لەم ماوەیەدا توانرا لایەنگر و پشتیوانی باش کۆبکەینەوە و بەوپەڕی هێزەوە بەچەندین وتاری بەهێزوو وروژێنەر ڕەوتەکەی ئاشکراکرد ،بەم شێوەیە هەتا دەهات ناو و ناوبانگی ڕەوتەکە لەگەشەسەندندا بوون ،لە لایەکی ترەوە کارمان

بۆ ئەوە دەكرد ئەوكەسانەی تێوەگلابوون لەكاری دزی و گەندەڵی تالآنكاری ئەوانەش لەخۆمان كۆبكەینەوە وبەهەمووشێوەیەك هاوكاریان بكەین .مەبەست لەم كارە ئەوەبوو كە بەرپەرچی ئەوكەسانە بدەینەوە كە هێرش دەكەنە سەریان ودەیانەوێت لەناوی بەرن .هەندێك جار ئەم بەرهەڵستكاریە دەبووە هۆی بێ هیوابوونی .بەلآم من بەوە دڵنەوایم دەدایەوە وپێم دەوت ورەت نابێت بڕوخێت لەبەر ئەوەی پێغەمبەریش لەسەرەتادا بەتووندی هێرش دەكرایە سەری بەلآم وەك دەبینیت لەئەنجامدا سەركەوتووبوو باسی ئەوەشم بۆكرد بەڵێ ئەم ڕێگایەی كە هەڵیبژاردووە ڕێگایەكی سەخت ودژوارە دەبێت دان بەخۆتدا بگریت وبەردەوام بین لەبەر ئەوەی ئەمە ڕێگای شكۆو سەروەری وچاكسازی ڕاستەقینەیە ودەبێت بەردەوامبیت.بەم شێوەیە بەردەوام بوین لەگەڵ نەیارەكانمان .بۆیە بیرم لەدانانی سیخوڕەكردەوە لەناو نەیارانی شێخ وتوانیمان بە پارە قایلیان بكەین .بۆئەم مەبەستە هەركاتێك هەواڵی ئەوە بدرایە كە پلان دابنرێت بۆ هەر پشێویەك وهێرشێك ڕاستەوخۆ لەلایەن سیخوڕكانمان هەواڵمان بەدەست گەیشت وهەرلەوێش پلانەكانمان پوچەڵ دەكردەوە و.جارێكیان هەواڵم پێگەیشت كەپلانێك هەیە بۆتیرۆركردنی شێخ .بۆئەم مەبەستەش پلانێكی تۆكمەم بۆدارڕشت بۆناشرینكردنی نەیارانی شێخ .بەشێوەیەك ئامانجەكەی پێكاو توانرا هەستو سۆزی خەڵكێكی زۆر بۆلای خۆمان ڕابكێشین وپیلانەكەیان پووچەڵ بكەینەوە .شێخ (محمد عبدالوهاب) بەڵێنی ئەوەی پێدام هەمووپیلانەكان جێبەجێ دەكات .بەلآم هەندێك بابەتی هەستیاری بۆ باس كردم و ووتی ناكرێت لەئێستادا هەندێك لەو برگانە جێبەجێ بكرێت كەلەپلانەكەدا هاتووە بۆنموونە ووتی بەهیچ شێوەیەك بیر لە ڕووخاندنی (كەعبە )بكەینەوە .لەبەرئەوە یەكێك لەبابەتە هەستیارەكانەو دەبێتە هۆی گوشاركردنە سەر هەست وسۆزی خەڵك وبەشێوەیەكی خراپ لەسەریان دەكەوێت .لەلایەكی ترەوە باسی لەوە كرد كە لەئێستادە دەست كاری كردنی قورئان كارێكی مەحاڵە .لەبەرئەوەی ترسێكی زۆری هەبوونەوەك دەسەلآت دارانی (مككە)و (ئاستانا)بەتوندی ڕووبەڕوویان بوەستننەوە .منیش پاساو بۆچونەكانیم بەهەند وەرگرت بەوپێیەی بارودۆخەكە لەبارنەبوو بۆ ئەو هەنگاوبڕیارانە .وەك ئەوەی شێخ ئاماژەی پێكرد .

دوای چەندین ساڵ لەمەشق وڕاهێنان دەزگاكەمان توانی (محمدبن سعود) بۆلای خۆی ڕابكێشێت .ئەمەش خۆی بەدەسكەوتێكی گرنگ دادەنرا بۆ دەزگاكەمان .بەم شێوەیە توانیمان لەڕێگەی هەردوو محمدەوە واتا

(محمد الوهاب)و(محمدالسعود)هەروەها لەڕێگەیانەوە توانرا هەست و بەسۆزی خەڵک بۆلای خۆیان ڕابکێشن .بەوپێیەی ئەگەر سەیری مێژوو بکەین هەردەسەڵات وحکومەتێک بەرگی ئاین وخوداپەرستی پۆشی بێت ماوەیەکی زۆر لەدەسەڵاتدا ماوەوهەژموونی خۆی بەشێوەیەکی بەرفراوان سەپاندووە .بەم شێوەیەش هەژموونی ئێمەش فراوان بوو بەو پێیەی توانیمان لە ڕێگایانەوە دەسەڵاتێکی پتەو بونیاد بنرێت کەلە بەرژەوەندی ئێمە گوڕ بکات .شاری (الدرعیە)مان کرد بە پایتەختی دەسەڵاتەکە .دەزگاکەشمان بەشێوەیەکی نهێنی هاوکاری دەکردن و نەیدەهێشت پێویستیان بە هیچ بێت لەلایەکی دیکەوە هەندێک لە ئەفسەرە مەشق پێکراوەکانی خۆمانمان خزاندە ناو دەسەڵاتەکەیان .بۆئەوەی بەشێوازێکی باش ئاگاداری جموجۆڵەکانیان بین ,ژمارەی ئەوانەی کە باوەڕپێکراوبوون یانزە کەس بوون کەمن یەکێک بوم لەوانە .کاری ئێمە مەشق کردن وڕاهێنان و دارشتنی نەخشەو پلان بوو. بەم شێوەیە هەردوومحمدەکە لە ژێر کۆنترۆڵ وهەژموونی ئێمەدا بوون وبە پێی ئەو نەخشە ڕێگایەنە دەڕۆشتن کەبۆمان دادەڕشتن .هەنێک جاریش ئێمە گوێمان لەوان دەگرت.بەمەرجێک لەو هێڵانە لانەدرێ کەئێمە ڕامان کێشاوە .لەلایەکی تریشەوە پرۆسەی هاوسەر گیریمان لەگەڵ کچانیاندا ئەنجام دا.من وەک خۆم زۆرسەرسام بووم بە ئەفرەتی عەرەب لەبەر ئەوەی زۆر بەخزمەت بوون بۆ مێردەکانیان .ئەم پرۆسەیە وای کرد پەیوەندیمان لەگەڵ هۆزەکان پتەوتربێت هەتا دەهات بارودۆخەکە بەشێوەیەکی بەرچاو لەبەرژەوەندی ئێمە رۆژ بە ڕۆژ بەرەو پێشترو باشتر دەچوو.ئەگەر بەم شێوەیە بەردەوام بێت دەتوانین هەژموونی خۆمان فراوان تروو گەورەتر بکەین لەسەر ئاستی جیهان ودەتوانین ببین بەهێزێک کە هەموودنیا بەو پەڕی شکۆوە لێی بڕوانێت و نەوەکانی داهاتووش بەرهەمی ماندووبوونی ئێمە بخۆن وئەوانیش بەهەمان شێوە تێبکۆشن بۆ نەوەکانی داهاتوو لەپێناو مانەوەی دەسەڵاتەکەمان






# ڕووداوە مێژوویەکانی باشوری کوردستان و لکاندنی بە ویلایەتی موسڵەوە :

لە دوای جەنگی جیهانی یەکەم، لایەنە زلهێزەکانی ئەو کات بەتایبەت « بەریتانیا » کە ئەم وڵاتەی داگیر کردوە، بەدەر لە ویستی خەڵکەکەی، هەوڵیداوە باشوری کوردستان بلکێنێ بەم عێراقەوە هەرخۆشیان ئینگلیزەکان، ئەو وڵاتەیان ناو ناوە «وڵاتێکی دروستکراو» وڵاتێک لە پاش ویلایەتی موسڵ کە نزیکەی «هەشت ساڵ» درێژەی کێشا لە نێوان لایەنەکانی ئەو سەردەمە، ئەنجامەکەی ئەوە بوو باشوری کوردستانیان لکاندوە بەو وڵاتەوە کە لە سێ ویلایەتی « عوسمانی » پێکهێناوە کە ئەویش (بەغداد و بەسرە و ویلایەتی موسڵ)بووە. ئەگەر باس ڕووداوەکانی کوردستان بکەین سەرەتا لە سلێمانیی و پاشان ئەو ناوچەیەی کە میحوەری ئەو ڕووداوانە بووە، بۆ ئەوەی باشتر لە ڕووداوەکان تێبگەین.

دەبێت بزانین عێراق چۆن دروستکراوە و مەلیکیان چۆن بۆ هێناوە؟ یان ڕێککەوتنی عێراق و بەریتانیا چۆن کراوە؟ ئەگەر نەزانین ڕێککەوتنەکانی نەوت چۆن کراوە و ڕۆڵی بەریتانیەکان چۆن بووە؟ ئەگەر نەزانین، پشکی ڕوسەکان چۆن بووە و ڕۆڵی نەیارەکانی ئەوان چۆن بووە؟ ئەگەر نەزانین نفوس و زۆنەکانیان چۆن بووە؟

هەتاکو ئەمانە باس نەکەین ناتوانین خوێندنەوەیەکی بابەتی بۆ ڕۆڵی سەرکردایەتی ئەوکاتە بکەین.یان سەرۆک هۆزە کوردییەکان. زۆر جار بیستوومانە




کاتێک پەیوەندی بە شێخ مەحمود و ئینگلیزەکانەوە هەبووە، خێرا بڕیار دەدرێت شێخ مەحمود ئاستی دبلوماسی و ڕۆشنبیری سیاسی جۆرێک لە جۆرەکان لاواز بووە. ئەوە بەلای ئێمەوە هەڵەیە. دەتوانین دیوەکەیتری قسەی لەسەر بکەین. یاخود نەتەوەکانی تری ئەم ناوچەیە لە چوار چێوەی دەوڵەتی عوسمانی وەک: ئەرمەن و عەرەب و تورک و هتد.. توانیان سود لەو هەلومەرجە مێژووییەی پاش جەنگ وەربگرن. بە سود وەرگرتن لە بەیانی «بەریتانی - فەرەنسی» کە بڵاویانکردەوە لە ناوچەکە کە مژدەی ئەوەیانداوە وەک ڕزگارکەر هاتوون بۆ گەلانی ئەم ناوچەیە لە ژێر دەستی دیکتاتۆرییەت و زولم و زۆری عوسمانیەکان ڕزگاریان بکەن. بە سود وەرگرتن لەو بەندانەی سەرۆکی ئەوکاتەی ئەمریکا «وردو ویلسۆن» ١٤ بەندی پێشکەش کۆمەڵەی گەلانی ئەوکاتە کرد. لە نێویاندا بەندی ١٢ هەبوو کە مافی ئەوەی دەدا بە گەلانی ژێر دەستی عوسمانی کە حوکمی خۆیان بکەن. زۆربەیان لە دواییدا بوونە حوکمڕانی ناوچەکە. قەوارەی سیاسیان بۆ دروستکرا. ئەوەی کە مایەوە کورد بوو. ئەنجامەکەی بە پێوەلکاندنی بە وڵاتێکیتری عەرەبییەوە کۆتایی پێهات. وەک لەوەی ببێتە کیانێکی سیاسی.

ئەو ڕەخنەیە ئاڕاستەی سەرکردایەتی ئەوکاتە دەکرێت. کە کوردەکان لە نێو خۆیاندا. لە باشور و ناوچەکانیتر نەیانتوانیوە ئەو مافە دەستەبەر بکەن. یان دەوترێت یەکگرتوو نەبوون لە نێوخۆیاندا. یاخود دەوترێ بەرژەوەندی

بەریتانیەکان پشتیوانی نوێنەری کوردیان کردوە کە شەریف پاشای خەندان بووە لە پاریس، بۆ ئەوەی باکووری کوردستان لە ماوەی ٦ مانگدا لیژنەیەک پێکبهێن و «پرۆپۆزەڵێک» پێشکەش بکەن، لە خاڵی کۆتاییدا قەناعەت بە تورک دەکەن کە دەستبەرداری مافی خۆی بێت

هۆزەگەری و دینی.. زۆر بابەتی تر زاڵبووە بەسەر «ئنتیما»ی نیشتمانی، ئەم تێڕوانینەش ڕاستە. تێڕوانینێکیتر هەیە پێیان وایە بەریتانیاکان و فەرەنسیەکان بەرژەوەندییان وای خواستووە، کە کورد خاوەن کیانی خۆی نەبێت. ئەم بۆچوونەش ڕاستە.

ئینگلیز هەمیشە دوو ئارگیۆمێنتی « Argument» دوو مشت و مڕی هەیە پەنجا بە پەنجا ئەگەر هەردولایەنی مشتومڕەکە لێک بدەینەوە. پاشان دادوەریەکە بۆ هۆکارەکان بگێڕینەوە. ئەوە بە تەنیا حوکمی شێخ مەحمود نادرێت کە ئەم کەمتەرخەمیبووبێت. ئەبێ ئەو هەلومەرجە لەبەرچاو بگیرێت کە شێخ مەحمود ڕاپەڕینی کردوە. تیادا سیاسەتی کردوە لە سلێمانی. دانوستاندنی کردوە لەگەڵ تورک و بەریتانیەکان. ئەوەش دوای ئەوە دێت کە داگیرکاری هێزەکان لە ناوچەکەدا هەبوو. کۆنفرانسەکانی ئاشتی سیڤەر لەندەن، قوسطەنتەنیە، پاشان لۆزان، هاتنی لیژنەکان.. کە پەیوەندی بە ویلایەتی موسڵەوە هەبووە. پشکی نەوت.. ئەمانە دەبێت لێکبدرێنەوە و خوێندنەوەیەکی وردی بابەتەتیانە بکرێت پاشان دەتوانین ئەو بڕیارە بدەین کە کێ پیاوی ئەو سەردەمەی خۆی بووە. کێ کەمتەرخەم بووە.

**دوای ئەوەی جەنگی جیهانی یەکەم لە نێوان وڵاتانی هاوپەیمان ڕوویداوە:**

**بەرەی یەکەم: بەسەرۆکایەتی شانشینی بەریتانیا وەک:** ڕووسیا و فەرەنسا و بەریتانیا و ئەمەریکا و یۆنان و ئیتالیا و ڕۆما و سربیا و پەرتوگال و بەلەجیکا.

**بەرەی دووەم: بەرەی وڵاتانی ناوەند وەک:** دەوڵەتانی ئەڵمانیا و نەمسا و هەنگاریا و دەوڵەتی عوسمانی و بولگاریا. دروست بوو. ئیمپراتۆریەتی عوسمانی کە بە پیاوە نەخۆشەکەی ئەوروپا ناوی دەرکردبوو. چووە ڕێزی وڵاتانی ناوەندەوە. ئەم ناوچەیەش وەک زۆربەی ناوچەکانی جیهان بووە شەڕو نائارامی. لە پێش جەنگ وڵاتە زلهێزەکانی ئەوکات. بە تایبەتی بەریتانیەکان و ئەڵمانەکان و ڕوسەکان. لە ململانێیەکی هەمیشەیی و بەهێزدابوون کێ دەتوانێت شوێن پێی خۆی زیاتر قایم بکات لە ناوچەکەدا. ئەوەی کە دەمێنێتەوە زیاتر تەرکیزەکە لەسەر بەریتانییەکان بووە. چونکە ئەوان حکومی ناوچەکەیان بەرکەوت. ئەو سیستەمە حکومڕانیەی کە لە عێراقدا هەبوو تا ساڵی ١٩٥٨ بەریتانیەکان دایان هێنا. نفوسی سەرەکی بەریتانیەکان لە پێش جەنگ زیاتر لە کەنداوی فارسدا بوو. هەم نفوسی نەوتییان هەبوو لە ڕێگەی کۆمپانیاکانی (فارسی ئینگلیزی یان فارسی بەریتانی) ئەم کۆمپانیایە وەک مەدەنی کاری کردوە. بەڵام تابعی حکومەتی بەریتانیا بووە. دەرهێنان و بەرهەمهێنانیان لە ناوچەکانی ئێران و ناوچە سنوریەکانی عوسمانی بووە. دواترلە نەفتخانە و خانەقین بووە. لەهەمانکاتدا لەسەرەتاکانی سەدەی ٢٠ لە ساڵی ١٩٠٤ شتێکی تر هەبووە لەم ناوچەیە پێی وتراوە « هێڵی سکەی قیتاری بەغداد بۆ ئەڵمانیا » کە بەر ئەڵمانەکان کەوتووە وەکو هاوپێچێک بۆ ئەم گرێبەستە. ئەڵمانەکان دەرهێنان و وەبەرهێنانی نەوتیانیان لە ویلایەتی بەغداد و موسڵ هەبووە. بۆیە لێرە کێبڕکێ لەسەر نەوت دەست پێدەکات و ئەنجامەکەی بە پێکهێنانی کۆمپانیایەک دەست پێدەکات بە ناوی « کۆمپانیاتی تورکی بەریتانی» لە سەدا پەنجای (٥٠٪) ی پشکی بۆ بەریتانیاکان دەبێ و لە سەدا پەنجاکەی تریشی دابەش دەبێت بەسەر هۆڵندی و ئەڵمانەکاندا. ئەمە دەبێت لەبەرچاو بگیرێت. کە جەنگ دەست پێدەکات ئامانجی سەرەکی بەریتانیا پەلاماردانی باشوری عێراق بووە لە بەسرە لە مانگی ١١ی ١٩١٤ پاراستنی بۆریە نەوتییەکان بووە لە ئەهواز و ناوچەکانی سنوری عوسمانی. پاراستنی خەتی بازرگانی بەریتانی لە میزۆپۆتامیای ئەو سەرەدەمە بۆ هیندستان درێژ بۆتەوە. هەم لە هێڵی دەریایی و هەم هێڵی وشکانی. ئەوکاتە بەریتانیەکان بازرگانیان لە (٨٠٪)ی لەسەر ئەم هێڵە بووە. بۆیە هەر لەگەڵ

دەستپێکردنی جەنگدا، لیژنەیەک دەنێرن بۆ ناوچەکە بەسەرۆکایەتی کەسێک بە ناوی « بەنزن» ناوێک. لەسەر فەرمانی سەرۆک وەزیرانی ئەوکاتەی بەریتانیا لە ساڵی ١٩١٥ «هێندی ئەسکویس» دەنێرنە ناوچەکە. ئەو لیژنەیە بابەتی زۆر گرنگ بڵاو دەکەنەوە. باس لەوە دەکەن ئێمە تاکو بەصرە نەگرین وەکو قوڵایی ستراتیج ناتوانین ئەو خەتە ئاویە بەرەو هیندستان و ئێران و ئەو وڵاتانە بپارێزین. لەبەرامبەر مەترسیەکانی پەلاماری پێچەوانەی تورک و ئەڵمانەکان. لە هەمانکاتدا بەریتانیەکان پێیان وابووە ئەگەر بەصراشیان بەدەستەوە بێت بەبێ گرتنی بەغداد ئەوان ناتوانن پارێزگاری لە بەصرە بکەن. بۆ ئەوەی بەغداد ببێتە ناوەندی حکومڕانی لە ناوچەکە پێویستیان بە ئەوەهەیە ویلایەتی موسڵیش بگرن. ئەگەر وانەبێ ئەوکەسانەی کە ڕاپۆرتەکەیان بەرزکردۆتەوە. ئەگەر تورکەکان لە ویلایەتی موسڵ بن واتا بە بەردەوامی زیاتر (١٠٠کم) لە بەغدادەوە دوردەبن. کە هەر کاتێک ویستیان تەنیا بەگرتنەوەی ئاو بە ڕێگریکردن لە بەروبوومی کشتوکاڵی لە نە ناردنی تەختەو بەروبومی ئاژەڵداری دەتوانن برسیەتی بۆ باشور و ناوەڕاستی عێراق دروست بکەن. کاتێک جەنگ دروست دەبێت ئەم ڕاپۆرتانەش دەبن. ڕێککەوتنی جەنگیش هەبووە کە بە نهێنی کراوە. پێویستە هەموو ئەو ڕووداوانە لێک بدرێتەوەو لە کۆتاییدا گفتوگۆ لەسەر ئەنجامەکەی بکرێت.

پاش گرتنی بەصرە بەریتانیەکان بیر لەوەدەکەنەوە کە بەرەو سەرترهەڵکشێن. هەر واشدەکەن. کاتێک لە ١٩١٥ بەصرە دەگرن بیر لەوە دەکەنەوە پێشڕەوی بەرەو بەغداد بکەن. بەم پێشڕەوییە فەرماندەکان پێیان وایە توشی کۆمەڵێک بەربەست دەبن. فەرماندە سەر بازییەکەن پێیان وایە ئەگەر بە دوو لیوای تر پشتگیری نەکرێن جا لە هیندستانەوە بێ یان لە میسرەوە بێ ئەوان ناتوانن بەغداد بگرن. هەندێکیان پێیان وایە دەتوانن بە غداد بگرن و تورکەکان تێک بشکێنن. بەڵام دەڵێن ڕەنگە نەتوانین لە دوو مانگ زیاتر لە بەغداد بمێنینەوە. بۆیە سەرکێشییەک دەکەن بڕیاری گرتنی بەغداد دەدەن. بۆیە لەشەڕێکدا بە ناوی» کوتل عمارە» تێک دەشکێن. بەشێوەیەک سەرکردەکەیان بە ناوی (جەنەڕاڵ تاونشێد) دەگیرێن لەگەڵ ٢٠٠٠ هەزارسەربازدا. ئەمە کاریگەری لەسەر سومعەی هێزەکانی بەریتانی دەبێت. وەک خۆیان کە لە ئەدەبیاتی سەربازی خۆیاندا دەیڵێن. دەڵێن: لە ١٠٠ ساڵی ڕابوردو توشی شکستی ئاوا نەبووین. بە جۆرێک لە ناوچەکانی وڵاتەکانی عەرەبی و جیهانی ئیسلامیدا لە مستەعمەرەکانی هیندستاندا. ئەوە

بڵاو دەبێتەوە کە دەکرێت بەریتانیەکانیش تێک بشکێنرێن وەک هەر گەلێکیتر.
لە دوای ئەوە بەریتانیەکان جارێکیتر لە مانگی ئازاری ١٩١٧ خۆیان ڕێکدەخەنەوە و پلانی نوێ دادەنێن. بەسەرۆکایەتی « جەنەڕاڵ ستانلی مود) بەغداد دەگرن. گرتنی بەغداد خاڵێکی نوێیە لە مێژووی سیاسی ناوچەکە. بەڵام ئەوان بەوەشەوە ناوەستن بڕیاردەدەن بەرەو موسڵ بڕۆن. لەکاتێکدا پێش گرتنی بەغداد لە ساڵی ١٩١٦ ڕێککەوتنێکی جەنگی هەیە بە ناوی «سایکس بیکۆ» ئەم ڕێککەوتنە نهێنی بوو تا ئەوکاتەی شۆڕشی بەلشەفیەق لە ڕووسیا ڕوویدا لە ئۆکتۆبەری ١٩١٧. شۆڕشگێرانی شوعی ئەوکاتە لە دژی ڕژێمی پێشوو لە بەرەکانی جەنگ کشانەوە. ڕێککەوتنەکەیان بۆ ڕایگشتی ئاشکرا کرد. بەوەش بەریتانیەکان و فەرەنسیەکان توشی ئیعراجیەکی گەورە بوون. کە بەخەڵکیان وتبوو ئەوان بۆ ئازادکردنی گەلانی ژێردەستەی عوسمانی هاتوون. بەڵام هێشتا جەنگە جیهانییەکە تەواو نەبووبوو کێکەیەیان لە نێوان خۆیاندا دابەشکرد.
بە پێی ڕێککەوتنەکە ویلایەتی موسڵ کە مەبەستمان باشوری کوردستانیشە بەر فەرەنسیەکان کەوت. هەر بەپێی ئەو ڕێککەوتنەکە پێش کشانەوەی ڕوسەکان کە ئەوانی تێدا بوو. دەبوایە لە خەتی کرماشان و خانەقینەوە بڕۆن بەرەوە

لەبەر ئەوەی تورکەکان خۆیان بە میراتگری عوسمانی زانیوە لە تورکیا « بزوتنەوەی کەمالیستیەکان» کە مستەفا کەمال سەرۆکایەتی دەکات لە دوای ساڵانی ١٩١٨ بۆ ١٩١٩ کە لە ناوچەکانی ئەنادۆڵەوە بە هێز دەبن بانگەشەی ئەوە دەکەن کە ویلایەتی موسڵ مافی ئەوانە

موسڵ. بەریتانیەکان پشتگیری سەربازی و لۆجستیکیان پێشکەش بکەن. دوای کشانەوەیان ئەو بۆشاییە سیاسی و سەربازییە دروست دەبێت. کە ڕوسەکان دەکشێنەوە هەر بەو هێڵەی لێی هاتوون بە ناچاری بەریتانیەکان بەرەو موسڵ دەڕۆن. یەک بە یەک ناوچەکانی موسڵ دەگرن. تاکو ئەوکاتەی چەند ڕۆژێکی دەمێنێت بۆ ئاگربەستی» مۆدرس» کە لە ۳۰ی ئۆکتۆبەری ۱۹۱۸ ئەنجام دەدرێت لە نێوان هەردوو هاوپەیمانەکان. بەرەی یەکەم: بەسەرۆکایەتی شانشینی بەریتانیا. بەرەی دووەم: بەسەرۆکایەتی دەوڵەتانی ناوەند.

لە دوای ئەوە بە چەند ڕۆژێک شاری موسڵ لە لایەن بەریتانیەکانەوە دەگیرێت و کێشە دروست دەبێت. پاشان بڕیار لەسەر کێشەکە دەدرێت. کە پێی دەڵێن کێشەی ویلایەتی موسڵ. لەبەر ئەوەی تورکەکان خۆیان بە میراتگری عوسمانی زانیوە لە تورکیا « بزوتنەوەی کەمالیستیەکان» کە مستەفا کەمال سەرۆکایەتی دەکات لە دوای ساڵانی ۱۹۱۸ بۆ ۱۹۱۹ کە لە ناوچەکانی ئەنادۆڵەوە بە هێز دەبن بانگەشەی ئەوە دەکەن کە ویلایەتی موسڵ مافی ئەوانە. لەبەر ئەوەی دوای ئاگربەست ڕاگەیاندراوە و بەریتانیەکان پشڕەوییان کردوە وگرتوویانە. کێشەکە لایەنێکی یاسایشی هەبووە لەبەر ئەوەی بەریتانیەکان دوای جەنگ موسڵیان گرتووە. ئەوانیش بیانویان ئەوە بووە دوو خاڵ لە ڕێکەوتنەکەدا هەیە خاڵی١٦ ئەڵێ: عوسمانیەکان خۆیان ڕادەستی نزیکترین بارەگا و بنکەی سەربازی هاوپەیمانان بکەن. خاڵی۷ مافی ئەوە دەدات بە هاوپەیمان هەر بنکەیەک ببێتە جێگەی مەترسی دەتوانن بیگرن. بەریتانیەکان بیانویان ئەوە دەبێت لەو ڕووەوە گرتوویانە. بەڵام ئەم کێشەیە درێژە دەکێشێت. بۆیە لە ۱۹۱۸ بۆ ۱۹۲۰ حکومی بەریتانی لە ویلایەتی موسڵدا حکومێکی سەربازی ڕاستەخۆ دەبێت. ئەو دوو ساڵی حکومڕانیە کێشەی ویلایەتی موسڵ لەگەڵ تورکەکان بەردەوام دەبێت. هەر لەو دوو ساڵەدا ڕێککەوتننامەی جۆراو جۆر ڕوودەدات. لە پاریس ڕێکەوتننامە هەیە بە ناوی ڕێککەوتننامەی ئاشتی لە ۱۸ی۱ی ۱۹۱۹ دەست پێدەکات. قەزیەی موسڵ بە چارەسەر نەکراوی دەمێنێتەوە. لە دوای ئەوە ڕێککەوتننامەی سیڤەر هەیە کە ڕێکدەکەون لەسەر پەیمانەکە کە لە ۱۳ بەش و ٤۳۳ بەند پێکهاتبوو. لە بەندەکانی ٦٢-٦٣-٦٤ ڕاستەوخۆ باسی کورد و ئایندەی کوردستانی کردبوو. پەیوەندی بە چارەنوسی کوردەکانی ژێر دەستی عوسمانییەوە هەبوو. کوردستانی عوسمانی مەبەست لێی کوردستانی باکور و ڕۆژئاوا و باشورە. ئێرانی تێدا نەبووە. لەبەر ئەوەی ڕژێمی قاجەرلە کاتی

دەستپێکردنی جەنگدا ڕایانگەیاند ئەوان نابنە تەرف و ناچە خاڵی هیچ بەرەیەکی شەڕەکەوە بۆیە دواترلەم هەموو کێشە و گرفتە باس لە چارەنوسی کوردستانی ئێران نەکراوە وەک ئەوەی ئنتیدابی ئەو هێزانە بێت، بەڵکو لە چوارچێوەی ئێراندا دەمێنێتەوە. بۆیە لەوێ باس لە چارەنوسی کوردستان کراوە. لەگەڵ ئەو بەشەی باشور، بەلام بەداخەوە بە چارەسەر نەکراوی مایەوە. ئەوەی کە هەشبووە سیاسەتی هەڵخەڵەتاندن بووە. بەریتانیەکان پشتیوانی نوێنەری کوردیان کردوە کە شەریف پاشای خەندان بووە لە پاریس. بۆ ئەوەی باکوری کوردستان لە ماوەی ٦مانگدا لیژنەیەک پێکبهێن و «پرۆپۆزەڵێک» پێشکەش بکەن. لە خاڵی کۆتاییدا قەناعەت بە تورک دەکەن کە دەستبەرداری مافی خۆی بێت. لە خاڵی سێیەمیشدا ئەڵێ: ئەگەر باشورئامادەبێت بچێتە ئەم بەشەی باکورەوە ئەوە کیانێکی کوردی دروست دەکرێت. لە کاتێکدا باشور لە چوارچێوەی ویلایەتی موسڵدا بووە. لەهەمانکاتدا لە موسڵ ڕێککەوتنی تر هەبووە لە نێوان بەریتانیەکان و فەڕەنسیەکاندا کە ڕێک نەکەوتوون. کە چۆن بەریتانیا بیکاتە بەشێک لە زۆنی خۆی. تا ئەو کاتەی بە پێی ڕێککەوتنی « سایکس بیکۆ» بەشێک بووە لە نفوسی فەرەنسیەکان. لە دوای ١٩١٨ ئەوەی هەبووە جارێکیتر گفتوگۆکردن بووە لە نێوان فەڕەنسیەکان و بەریتانیەکان. بۆ ئەوەی موسڵ ببێتە بەشێک لە نفوسی بەریتانیا. ئەمە دواجار لە ١٩٢٠ لە کۆنگرەی سان ڕیمۆ دەکرێت.

سەرچاوەکان


١. کوردەکانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی د. جەلیلی جەلیل و: لە ڕووسییەوە د. کاوس قەفتان بەغدا ١٩٨٧

٢. کوردستان لە نێوان ململانێی نێودەوڵەتی و ناوچەیی دا (١٨٩٠-١٩٣٢). کامەران مەنتک . سلێمانی ٢٠٠٠

٣. تۆماس ودرۆ ویلسۆن (بە ئینگلیزی: Thomas Woodrow Wilson ) سیاسەتمەدار و ئەکادیمی ئەمریکی بوو کە لە ساڵی ١٩١٣ تا ١٩٢١ وەک ٢٨مین سەرۆک کۆماری ویلایەتە یەکگرتووەکان لەسەرکار بوو. لە ساڵی ١٩١٢. ویلسۆن سیاسەتی ئابووری نەتەوەکەی گۆڕی و لە ساڵی ١٩١٧ ئەمریکای بەرەو جەنگی جیهانی یەکەم بر

٤. کێشەی موسڵ لە وێستگە مێژووییەکاندا. د. جەبار جبار قادر . https://www.pukmedia.com/KS/details/?Jimare=٩٢٤٥٥

٥. کۆنگرەی (سان ڕیمۆ)و مافی سپاردەی ئێراق بە دەوڵەتی بەریتانیا..(کۆنگرەی سان ڕیمۆلە ١٨-٢٦ی نیسانی١٩٢٠ز) لە شاری (سان ڕیمۆ)ی وڵاتی (ئیتاڵیا) لەنێوان هەر (دوو) دەوڵەتی (شانشینی بەریتانیا و فەڕەنسا)و لەژێر چەتری سیاسی دەوڵەتی ئیتاڵیا و بە ئامادەبوونی نوێنەری وڵاتانی (ژاپۆن. بەلجیکا. یۆنان)و شاندێکی جوو واژۆ کرا...






# پیرەمێردو سروودی نیشتمانی
# (١٨٦٧ — ١٩٥٠)

سروود کە هەوێنی جۆشدان و گڕگرتنی دەروونی پڕ لە سۆی گەلانی چەوساوەو ژێردەستە، شاعیرە شۆڕشگێڕ و داهێنەرو نیشتمانپەروەرەکان کە هەمیشە بیرو ئەندێشەیان لە خۆشەویست کردنی نیشتمان و چاندنی تۆوی عیشق و خاکپەرستی لە ناخی گەلدا دەخولێتەوە. هەرگیز پلەو پایەو کۆشک و تەلاری داگیرکەر،و دوژمنانی ئازادی فریویان نادات. وەک زێوەر دەڵێت: «زەڕەیەک خاکی وەتەن نادەم بە قەسری قەیسەری». پیرەمێردی نەمریش یەکێکە لەو شاعیرە نیشتمانپەروەرانەی کە ئەوینی خاک و زێدەکەی دوای چەندان ساڵی ئاوارەیی و وەرگرتنی پۆستی بەرز بەرز لە وڵاتی تورکیا رێی گەڕانەوەی بەرەو کوردستان پێ دەگرێ و ئەو زانست و زانیاریەی لەوێ فێریشی بووە، دەیخاتە خزمەتی گەلەکەی و ساڵانی دواتر پێشەنگی کردنەوەی ئاگری نەورۆزو رێکخەری ئاهەنگی ئەم یادە دەبێ لە گردی (یارە)و کارێزی (وەستا شەریف). سروودە مارسلیزئاساکەی (نەورۆز)یش بەرهەمی ئەو عەشقە پیرۆزەی پیرەمێردی نەمرە بۆ نەورۆزو جەژنی نەتەوایەتی (دوور لەم بۆچوونانە)ی ئەمڕۆ کە رووداوە مێژووییەکان پێچەوانە دەخوێننەوە.

سروودە هەمیشە زیندووەکەی (نەورۆز) لە ساڵی ١٩٤٨ دانراوە، کە بە (نەورۆزی ساڵی بروخێ) ناسراوە، چونکە لەو ساڵەدا راپەڕینێک لە زۆربەی شارەکانی عێراقدا بەرپا

بوو دژی ڕێکەوتننامەی (پەیمانی پۆرتسموپ) کە ساڵح جەبر لەگەڵ بەریتانیا ئیمزای کردبوو لە ١٩٤٨/١/٥. پیرەمێردیش لەناو ئەم ڕووداوە ژیاوە. کە ڕۆژانە لە بەر دەرکی سەرا کاروانی خۆپیشاندەران هوتافیان کێشاوە.



*«ئەم ڕۆژی ساڵی تازەیە نەورۆزە هاتەوە*
*جەژنێکی کۆنی کوردە بە خۆشی و بەهاتەوە*
*چەند ساڵ گوڵی هیوای ئێمە پێ پەست بوو تاکوو پار*
*هەر خوێنی لاوەکان بوو گوڵی ئاڵی نەوبەهار» 1*

پیرەمێرد لە دێری دووەمی ئەم سرووده ئاماژە بە شکست و نەهامەتی و ژێردەستەیی ساڵەهای کورد دەکات تا دەگاتە (تاکو و پار)، مەبەستی لە سێدارەدانی چوار ئەفسەرەکەیە. لای شاعیر گوڵی سوورو ڕەنگاوڕەنگی بەهار خوێنی شەهیدانی دوێنێ و ئەمڕۆیە. کە بێ باک لە مردن بۆ ئازادی خوێن دەڕێژن.

*«ئەو ڕەنگە سوور بوو کە لە ئاسۆی بڵندی کورد*
*مژدەی بەیانی، بۆ گەلی دوورو نزیک ئەبرد» 2*

ئەو ڕەنگە سوورە مەبەستی ئەو خوێنە گەشەی شەهیدانی کوردستانە. کە بۆتە هەوێنی هەڵاتنی ڕۆژێکی نوێ و مژدەی سەرفرازی و رزگاری بە گەلانی جیهان دەگەیەنێ و پیرەمێرد لە شیعرێکی تردا دەڵێت:

*«کورد نابڕێتەوە خەیاڵتان خاوە*
*بەراتی نەجات بە خوێن نووسراوە» 3*

پیرەمێرد گەیشتۆتە ئەو راستییە، کە بە بێ خوێن بەخشین هیچ گەلێکی ژێردەست ناگاتە ئامانج و لە دیلیەتی دەر ناچێ.

***«نەورۆز بوو ئاگرێکی وەهای خستە جەرگەوە***
***لاوان بە عەشق ئەچوون بە بەرەو پیری مەرگەوە»*** 4

گڕی نەورۆز ئەوەندە پیرۆزو کاریگەرە لەسەر دڵ و ناخی لاوان، کە بۆ نەکوژانەوەی بڵێسەی ئەم ئاگرە، کە رەمزی ئازادی و مەرگی زۆردارانە، بە عەشقەوە تێدەکوشن و ترسیان لە مەرگ نییە.
لە دێرێکی تردا دەڵێت:

***«تا ئێستە رووی نەداوە لە تاریخی میللەتا***
***قەڵغانی گوللە سنگی کچان بێ لە هەڵمەتا»*** 5

«کە دێتە سەر (قەڵغانی گوللە سنگی کچان بێ) ئەمووست راکێشانە بۆ راپەڕینی کانوون، شەڕی سەر پردی بەغدا کە کچانی کۆلێژەکانی بەغدا سنگی خۆیان کردبوو بە قەڵغانی گو گوللە و رەشاش و میترالیۆز سڵیان نەدەکرد»
لە دێری کۆتایی دا دەڵێت:

***«پێی ناوێ بۆ شەهیدی وەتەن شیوەن و گرین***
***نامرن ئەوانەی وا لە دڵی میللەتا ئەژین»*** 6

شەهید باڵای کە هێندە بەرزو گیانی بەرزەفڕ بێ لە ئاسمانی نیشتمان پێویستی بە شیوەن و رۆرۆ نییە، چونکە ئەو کەڵەمێردانەی بە خواستی خۆیانو خوێنی خۆیان بوونەتە پارێزەری گەل و نیشتمان هەرگیز نامرن و هەمیشە زیندوون و رەمزی سەربەرزی و قوربانیدانن، ئەم دێرەی چەند ساڵێک



پێشتر لە شێوەنی مامۆستا (عەبدولواحید نووری) نووسیوە، ئامادەکەرانی دیوانی پیرەمێرد دەڵێن: «تا بزانرێ لە چ بارودۆخێکدا و لە چ زەمینەیەکی خۆشکراودا، پیرەمێرد ئەو شیعرەی وتووەو ئەوەش روون بێ کە ئەگەرچی راپەڕینی کانوون هەوێن بوو بۆ شیعرەکەی، بەڵام داستانی قارەمانێتی کورد و خەباتی خوێناوی رۆڵەکانی لە شیعرەکەدا وەک ئاوێنە دەردرۆشێتەوە».

پیرەمێردی شاعیر خاوەنی کۆمەڵێک شیعری تری نیشتمانی و چەند سروودێکی ترە، وەک: گۆرانی بەهار

*«کە دەڵێن، ئەمرۆ رەشتو کێو شینە*
*چەنرە مەڵبەندی ئێمە شیرینە*
*بچۆ سەرگردی یارە ببینە*
*لە جیهاندا گوڵێکی رەنگینە» 7*

«ئەم سرووده بە رای من لە ئاوازی عەرەبی وەرگیراوە، کە لە بنچینەدا (موشحاتی) ئەندەلوسیە، بۆ یەکەم جار گۆرانیبێژ مەلا کەریم لە ساڵانی سییەکان لەسەر گرامافۆن واتە (قەوان) تۆماری کردووە و دواتر هونەرمەند مەزهەر خالقی، ساڵی ١٩٨٦ بە شێوەیەکی جوان دووبارە تۆماری کردۆتەوە» 8. شاعیر باس لە جوانی شاری سلێمانی لە وەرزی بەهاردا دەکات، کە چۆن سەوزایی سەرتاپای شاخو پێدەشتی داگرتبێ و بە تایبەت لەسەر گردی مامە یارە دیمەنی رەنگینی دیارە، کە لە جیهاندا وێنەی نییە. ئەم سرووده وەسفێکی زۆر شاعیرانەی پیرەمێردە بۆ شاری سلێمانی.
(سروود بۆ نەوجوانان): ئەم سرووده لە خوێندنگاکاندا وتراوە، کە هانی خوێندکاران دەدا روو لە زانست بکەن و دوا نەکەون و تێبکۆشن بۆ ئازادی.

*«ئەی نەوجوانانی وەتەن*
*سا پێش کەون ئازا برۆن*
*ئێوە بەرەو زانین برۆن*
*رەی تێکۆشن دوا مەکەون*
*لە سێبەری سەربەستی دا» 9*

لــه كۆپلەیەكــی تــر روو لــه دوژمنــان دەكات، كــه گــەل دەچێتــه كــۆڕی خەبــات و رزگاری دەبــێ لــه چەوســانەوە و چیتــر لــه كۆیلەیەتــی نازیــن و دڵــت خــۆش نەبــێ بــه ژێردەســتیمان

*«ئەی دوژمنەكانی نەزان*
*گەل ئەچێتە كۆڕی مەیدان*
*رزگار ئەبێت وڵاتمان*
*زوو نامێنێ دواكەوتنمان*
*بە هێزی لاوی نەوجوان»* ١٥

ســروودی (ئێمــه كوردیــن): ئــەم ســرووده لــه ســاڵی ١٩٢٦ وتــراوه و تــا كۆتایــی حەفتاكانیــش لــه خوێندنگاكانــدا دەوتــراوه، كــه بــاس لــه خۆشــەویستی زمانــی كــوردی و لاوك و بەســتەو گۆرانــی كــوردی چەنــده بەســۆزن لــه ئاســت نامــەی ئاســمانی داود پێغەمبــەرەوه (س.خ) بــه نــاوی (زەبــوور). لــه وەســفی كوردســتانیش لــه لای هێنــده جــوان و خــۆش و رەنگینــه. بــه جۆرێــك كــه دەڵێــت: (جنــه المــأوی) وا لــه شــارەزوورەوه. هێنانــی نــاوی چەنــد ســەركرده و كەســایەتی مێژوویــی كــورد، كــه لــه رێــی نیشــتمان گیانیــان بەخشــیوه. لای شــاعیر وایــه نموونــەی ســەركردەكانی كــورد لای گەلانــی تــر نییــه. كــه ئەمــه بۆچوونــی شــاعیر خۆیەتــی. لەوانەیــه پێچەوانــەش بــێ:

*«ئێمە كە كوردین لە لامان وایە*
*زوبانی كوردی زۆر بێ هاوتایە*
*لاوكی كوردی دەنگی زەبوورە*
*«جنە المأوی» لە شارەزوورە»* ١١

لــه كۆتایــی ســروودەكه شــاعیر دەگاتــه ئــەو راســتییه، كــه تــا لاوان گیــان بەخــت نەكــەن لــه رێــی نیشــتمانو هــەزاران لــەم پێنــاوەدا شــەهید نەبــن و بــه خامــەی خوێــن شــیوەنیان بــۆ نەكــرێ، هەرگیــز كــورد رزگاری نابــێ و ژێردەســته دەمێنێتــەوه.

*«ئەم میللەتەی كورد رزگاری نابێ*
*پێشك ئەم ئیشە هەر ئەبێ وابێ»* ١٢

پیرەمێردی نەمر وەک شاعیرێکی هوشیارو پێشکەوتنخواز و درک کردن بەو راستیەی، ئەگەر ژن نەیەتە مەیدان و هاوبەشی پیاو نەکات لە ئەرک و فەرمانی رۆژانەداو کچان رێی خوێندن نەگرنە بەر، ئەوا پێشکەوتن و دەرچوون لە تاریکی ژیان مەحاڵە، بۆیە هانی کچان دەدا روو لە خوێندنگا بکەن، چونکە وەک ئەو وتەیەی کە بڵاوە (ژن نیوەی کۆمەڵەو دایکی نیوەکەی ترە)، پیرەمێرد دڵنیایە ئەگەر دایکی نەوەی نوێ خوێندەوار بێ، بێگومان نەوەیەکی هوشیار و نیشتمانپەروەر و زانستخواز پێدەگەن، کە ئەمەش مژدەی رزگاربوون و بە کاروانی گەلان گەیشتنە.

**ئەی کچینە**

**«ئەی کچینە! وەرنە مەکتەب، ئێوە تەسکینی دڵن**
**زینەتی باغو تەرەقین، رەونەقی دەستەی گوڵن**
**تازە ئێمە تێگەیشتووین، دایکی چاکی خوێندەوار**
**نەسڵی وا دێنێتە مەیدان، قەومەکەی پێ بێتە کار**
**هەر کچانی خوێندەوارە، میللەتی پێ سەر کەوێ**
**تەربیەی منداڵ هیوایە، پێشڕەویمان بەر کەوێ» ١٣**

سەرچاوەکان


١- دیوانی پیرەمێرد، چاپخانەی زەمان، بەغدا، ١٩٩٠، ل ٢٠٧.
٢- سەرچاوەی پێشوو . ل ٢٠٨.
٣- سەرچاوەی پێشوو . ل ٩٢.
٤- سەرچاوەی پێشوو، ل ٢١٠.
٥- سەرچاوەی پێشوو . ل ٢١٠.
٦- سەرچاوەی پێشوو . ل ٢١١.
٧- پیرەمێرد، دیوان، محەممەد رەسووڵ هاوار، چاپخانەی شڤان، سلێمانی، ٢٠٠٧، ل ٣٣٥.
٨- جیهان بەخش محمد کۆیی . دیدەنی . لە هەولێر، ٢٠٠٧/١٠/١٢.
٩- دیوانی پیرەمێرد، بەرگی یەکەم، چاپخانەی زەمان، بەغدا، ١٩٩٠، ل ٢٠١.
١٠- سەرچاوەی پێشوو . ل ٢٠١.
١١- سەرچاوەی پێشوو . ل ٢٧٦.
١٢- سەرچاوەی پێشوو . ل ٢٧٧.
١٣- سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٦٣.





ئاوات گۆگەیی

کێ شەقامەکانی سلێمانیی ناوناوە؟

# ئاوڕدانەوەیەک لە (بەنگینە)ی شاعیری گەل

بەنگینە، شاعیری بەهەڵوێست و واقیعییەت، هەڵگری خەمی نیشتمانی و ماندووی ڕێگەی زانست و زانین و خوێندەوارییە، هەستی نەتەوایەتی وشۆڕشگێڕی و پەرۆشیی زۆری بۆ هۆشیاربوونەوەی گەلەکەی لە سەراپای هۆنراوەکانیدا ڕەنگی داوەتەوە.

ئەم شاعیرە، ئەگەرچی سالانی سی و چل و پەنجاکان ناوێکی دیاری ناو ڕۆژنامەکان و بۆنەو ئاهەنگە نەتەوەیی و نیشتمانی و بەرخودانەکان بووە و بە شیعرە ئاگرینەکانی ڕۆحی خەڵکی جۆشداوە و هانیداون بۆ خەبات و خوێندەواری و زانست و زانیاری، بەڵام زەمانە غەدرێکی زۆری لێکردووە و لە لای نەوەی ئێستا وەک ئەوەی هەیە، نەناسراوە.

بەنگینەی شاعیری گەل تا دوای ڕوخانی ڕژێمی بەعس لە ٢٠٠٣ دا شیعرەکانی نەکران بە کتێب و دیوانی بۆ چاپ نەکرا، لە دوای ئەو مێژووە و لە دوای ڕاپەڕینیشەوە زۆرکەم لە بارەیەوە نووسراوە، ئەوەی نووسراوە و باسیش کراوە لە ئاست گەورەیی خودی بەنگینە و لە ئاست بە پێزیی شیعرو پەیڤە نیشتمانیی و نەتەوەییەکانیدا، نییە.

## بەنگینە کێیە و کام ساڵی لە دایکبوونی راستە؟

لە دیوانەکەی و هەندێک سەرچاوەی تردا نووسراوە: ناوی (فەیزوڵڵا باقر ئەحمەد)ە و ساڵی لە دایکبوونی بە ۱۹۰۸ی شاری سەقزی خۆرهەڵاتی کوردستان نووسراوە و گوایا لە تافی لاویدا رویکردۆتە باشووری کوردستان و لە شاری سلێمانی نیشتەجێ بووە و بەوشێوەیە ژیاننامەکەی جێگیرکراوە. بەڵام لە کتێبی (گوڵچنی گیو)ی مامۆستا گیو موکریانی کە دکتۆرە کوردستان موکریانی-ی کچی لە دووبەرگدا چاپی کردووە. ژیاننامەکەی بەنگینەی تێدایە و جیاوازە لەو ژیاننامەیەی لە دیوانەکەیدا هەیە.

دیارە کتێبەکەی مامۆستا گیو شیعرو ژیاننامەی سەدان شاعیری کلاسیک و هاوچەرخی ئەوکاتەی لە خۆگرتووە. لەوانە (بەنگینە) کە شیعرێک و ژیاننامەکەی بڵاوکراوەتەوە و لە پەراوێزدا نووسراوە: ( لە ۱۹۷۲/۹/٦ لە خۆیم وەرگرتووە. گیو)- لاپەرە ۲٤۲.

واتا: مامۆستا گیو ژیاننامەکەی لە بەنگینە خۆی وەرگرتووە. ئێ دیارە ئەوەش راستترە لەوەی کە لە دیوانەکەی و لە هەندێک سەرچاوەی تردا بڵاوکراوەتەوە.

لەو کتێبەدا نووسراوە: فەیزوڵڵا کوڕی باقر کوڕی سۆفی. ساڵی ۱۹۰۰ لە سلێمانی لە دایکبووە. لە سەفەریەردا (دەبێت مەبەستی سەفەربەلەک بێت)



بە دایک و باوکەوە هەڵاتوون و روویان لە ئێران کردووەو چوون بۆ سەقز. لەپاش سەفەربەر. کە دایک و باوکی کۆچی دواییان کردووە. بە دووبرایانەوە گەڕاونەتەوە سلێمانی.

بەهەمان شێوە. لە کتێبەکەی مامۆستا عەبدوڵڵا زەنگەنە-شدا ( دەنگی کورد). هەمان زانیاری کتێبەکەی مامۆستا گیو و هی زیاتریشی تێدا تۆمارکراوە لە بارەی بەنگینەوە. لەوانە: بەشداریی راپەڕینەکەی رۆژی ٦ی ئەیلولی ۱۹۳۰ی کردووە و لەسەر ئەمەش شەش مانگ لەگەڵ بێکەسی شاعیر زیندانی کراوە. نووسراویشە: بەکێکیشە لە پێشمەرگەکانی کۆماری کوردستان لە مەهاباد و چۆتە خزمەتی پێشەوا قازی محەمەد.

کەواتــە: ســاڵی لەدایکبوونــی بەنگینــە ١٩٠٨ نییــە و ١٩٠٠ە، هەروەهــا نــاوی باپیریشــی (ئەحمــەد) نییــە و ســۆفی یــە.

## بەنگینە و پیرەمێرد

بەنگینــە خوێنــدکارو ئاشــنای پیرەمێــردی شــاعیر بــووە و هــەر بەگەنجــی کەوتۆتــە ژێرکاریگەریــی دنیابینــی و بیروبۆچوونەکانــی ئــەوەوە. زۆر دۆســت و نزیکــی یەکتــری دەبــن و تەنانــەت هەندێکجاریــش بــە پیرەمێــردی وتــووە (خاڵــە).

بــە کورتــی، بەنگینــە بــووە بــە رێبــواری سەوداســەری پیرەمێــردو لــە دوو رووەوە بۆتــە خوێندنــکاری ئــەو، هــەم لــە قوتابخانــەی زانســتی ئێــواران خوێندویەتــی و هەمیــش بەرهەمەکانــی لــە رۆژنامەکانــی ژیــن و ژیــان بڵاوکردۆتــەوە.

لــە ئاهەنگەکانــی جەژنــی نــەورۆز کــە پیرەمێــرد ســازیدەکردن، بەنگینــە بــە شــیعرو وتــار بەشــداریکردووە. لــە شانۆگەرییەکیشــدا رۆڵــی (حاجــی باقــی)ی بینــوە و ئــەو نــاوەی بەســەردا بــڕاوە. هەروەهــا لــە شــانۆیی(مەم وزین)یشــدا وەک ئەکتــەر رۆڵــی (بەنگیــن)ی بینیــوە. نواندنەکــەی ئەوەنــدە جــوان و ســەرنج راکێــش بــووە، پیرەمێــرد ناســناوی بەنگینــەی پێبەخشــیوە و ئیتــر کــەس بەنــاوی فەیزوڵــلاوە بانگــی نەکــردووە، بەڵکــوو بــووە بــە بەنگینــە یــان حاجــی باقــی، یــان هــەردوو ناوەکــە بەیەکــەوە (حاجــی باقــی بەنگینــە)، دواتــر نــاوی بەنگینــە بــووە بــە ناســناوی شــیعریی ئــەم شــاعیرە گەورەیــەی کــورد.

بەنگینــەی شــاعیر لــە ســەردەمی پاشــایەتیدا بــەردەوام لــە ریــزی خۆپیشــان و راپەرینەکانــدا بــووە و بــە شــیعرو وتــارە ئاگرینەکانــی جەمــاوەری جۆشــداوە، چەندینجاریــش دەســتگیرکراوە و خراوەتــە ژێــر ئــازارو ئەشــکەنجەی ســەختەوە. لەگــەڵ ئــازارو ژانــی گەلەکــەی و لەگــەڵ هەزارانــدا هاوهەڵوێســت بــووە، قوربانیــی داوە و ئاســوودەیی ژیانــی خــۆی خســتۆتە پێنــاو نەتەوەکەیــەوە، بۆیــە کاتێکیــش بەعســییەکان تەختــی فەرمانڕەوایــی عێــراق دەگرنەدەســت، بەنگینــە دەبێتــە ئامانجــی ئــەوان و لــە رەشــەکوژییەکەی زەعیــم ســدیقی خوێنرێــژدا فەرمانــی گوللەبارانکردنــی بــۆ دەردەکرێــت، بــەڵام بــە ئازایەتــی و وریایــی خــۆی، دەربــازی دەبێــت. لــە ئەنجامــی هەڵاتــن و گیــران و ئــەو بارودۆخــەی ئــەو ســەردەمەی ئــەوی تیــادا ژیــاوە، زۆرێــک لــە شــیعرەکانی فەوتــاون. لــە تــەواوی بۆنــە نیشــتمانی و نەتەوەییەکانــی ئەوکاتــە ئامادەیــی بــووە و شــیعرەکانی بوونــە هەوێنــی هەڵوێســت و حەماســی نیشــتمانیانەی خەڵــک، هــەر بۆیــە بــە شــاعیری گــەل ناســراوە.

حاجــی باقــی بەنگینــە لــە رۆژی ١٩٧٢/٩/١٥ کۆچــی دوایــی کــردووە و لــە گۆڕســتانی ســەیوان بەخــاک ســپێراوە.

## شیعرەکانی بەنگینە

بە وردبوونەوە لە تێکستە شیعرییەکانی، خوێنەر بۆی ڕووندەبێتەوە کە بەنگینە بەرلەوەی شاعیر بێت، کوردێکی خاوێن و کوردپەروەرو شۆڕشگێڕێکی خاوەن هەڵوێستی بەرزی نیشتمانییە، هەر بۆئەو مەبەستەش شیعری نووسیوە. واتا ئەدەب و توانا ئەدەبییەکەی لە خزمەت مەبەستە شۆڕشگێڕییەکەیدا بووە.
هاوارو خەمێکی قووڵ بە شیعرەکانییەوە دیارە. خەم لە ئێش و ئازارەکانی گەلەکەی و هاوارێکی بەرز و بڵند بۆ هۆشیاربوونەوە.

*چەندخۆشە پیربی و خوێنت گەرم بێ*
*وەتنفرۆشی لەلات شەرم بێ*
*بۆ خەباتکردن ژیرو چالاک بی*
*لەناو لاوانا دیارو تاک بی*
*قەسەم بە گەل و خاکی کوردستان*
*هەر خەبات ئەکەم، بە بێ پشوودان*
*قەت مل کەچ ناکەم لە ڕوی دوشمنان*
*هەتاکو ئەچمە ڕیزی شەهیران*

یان

*ئەوا من مردم نەگەیمە ئاوات*
*لاوان لامەدەن لە کۆڕی خەبات*

هەروەها پەندو ئامۆژگاریی دڵسۆزانە و لاکردنەوە لە خوێندن و فێربوونی زانست، پانتاییەکی زۆری شیعرەکانی گرتووە. لەو ڕووەوە تیشکی ڕووناکیی بیرکردنەوە فراوانەکەی بەنگینەمان بۆ دەردەکەوێت:

*تۆ وەرە تۆوی چاکە بچێنە*
*بۆت دێتە بەرهەم کاتی دروێنە*
*فراپە هیچی لێنایاتە بەر*
*بەهیوای مەبە تا ڕۆژی مەحشەر*

یان

*مەکتەب بۆ ئێوە پێویستە کوردان*
*ئەبێ پێی بڵێن بەهەشتی جیهان*

## سەرگوزشتەی ناونانی شەقامەکان

بە مەبەستی ناونانی شەقامەکانی شاری سلێمانی، ئەنجومەنی شارەوانی لە ژمارە ١٣٤٩ی هەفتەنامەی (ژین)ی ساڵی ١٩٥٧دا بانگەوازێکی بڵاوکردۆتەوە و داوای لە خەڵک کردووە ناو هەڵبژێرن. بەنگینەش بە پیر بانگەوازەکەوە چووەو بەم شیعرە بەشداریی کردووە کە لە ژمارە ١٣٥٠ی هەفتەنامەی ژین بڵاوی کردۆتەوە:

ژینی خۆشەویست، چرای ئەم شارە
ناونانی شەقام فەرزە ئەمجارە
لە سەرا بەرەو خوار ناوی نراوە
شەقامی کاوە، خاوەنی ناوە
شەقامی کەرکووک، بەهەشتی زەوی
ناوی لێبنێن جادەی مەولەوی
لەبەر سانەوی، هەتا سەرقەبران
ناوی لێبنێن شەقامی سەیوان
شەقامێك ئەڕوا بۆ ماڵە شێخان
خوا ناویناوە جادەی کانێسکان
ڕێگای سەدەکە، کە جادەی ناوە
سابوونکەرانە، قەت نەگۆڕاوە
پیرەمێرد، نەمر و دڵی زۆر جوانبوو
مزگرو زبانی ژیانی کوردانبوو
ئەویش لەم شارە بەشی خۆی ئەوێ
جا نازانم کام شەقامی بەرئەکەوێ.



بەنگینە و نەجمەدینی مەلا

وای بڵاوبوونەوەی ئەم شیعرە، ئەنجومەنی شاوەرانی سلێمانی پەسەندیکرد و شەقامەکانی بەوجۆرەی بەنگینە پێشنیازی کردبوو، ناونا.

## وەسفی گرەکەی یارە

بەنگینە چەندین شیعری جوان و ناسکیشی هەیە لە وەسف و ستایشی کوردستان و جەژنی نەورۆز و کەسایەتییەکان و تەنانەت ڕۆژنامەو گۆڤارەکانی ئەو سەردەمەش.

یەکێک لەو شیعرانە (ئۆخەی گردەکەی یارە)یە کە ڕەشۆڵی هونەرمەند و مەقامبێژ بە ئاوازێکی خۆش و بەسۆز، چریکاندویەتی و لەو ساوە تا ئێستاش رادیۆ کوردییەکان پەخشی دەکەن.

بەهۆی جوانی و بەرزیی ئاستی شیعرەکە و رەسەنایەتی دەنگی ڕەشۆڵەوە، ئەوە دوای ئەوە و دوای دەیان ساڵ لە تۆمارکردنی، هەر زیندووە و خەڵک دەیڵێنەوە.

سەرەتای شیعرەکە دەڵێت:

*ئۆخەی گردەکەی یارە*
*چەند شیرین و نازدارە*
*ئەو کاریزەی لە بەر پێی*
*ئاوی شیرینی شارە ....*

## عەشقی نیشتمان نەک هی چاوی جوان

زۆر بەکەمی شیعرێکی بەنگینە دەبیندرێت کە بۆن و هەستی ئەویندارانەی لە خۆگرتبێت، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی عەشقە نیشتمانییەکەی بەنگینە لە سەروو هەر هەست و حەزێکی زاتیی خۆیەوە بووە.

لەم رووەوە مامۆستا عوسمان هەورامی کە دیوانی بەنگینەی کۆکردۆتەوەو و ئامادەو چاپی کردووە، نووسیویەتی (پاش ئەوەی لە سەردەمی لاوی و هەرزەکاریدا، هەندێ هۆنراوەی دڵداری لە کانگای دەروونی بەکوڵیەوە سەریانهەڵداوە، لە پڕ گوژمە تەزوویەکی بەگوڕ، بەهەموو بوونیا گوزەریکردووەو، لە نووکی خامەکەیەوە، بەم چەشنەی خوارەوە، وزەو تینی دەرکەوتووە):

بەنگینە بەسیە وەسفی چاوی جوان
وەرگەڕێرە سەر مەدحی نیشتمان.

## رێگە نەدرا دیوانەکەی چاپ بکرێت

مامۆستا عوسمان هەورامی لە ساڵی ١٩٧٩وە سەرقاڵی کۆکردنەوەی شیعرەکانی بەنگینە بووە تا لە دوتوێی کتێبێکدا چاپیان بکات، لە ژمارەکانی بڵاوکراوەکانی ژین و ژیان و گەلاوێژو هەتاو شیعرەکانی وەرگرتووەو تۆماری کردوون، سەرئەنجام دیوانەکە ئامادەکراوەو نێردراوە بۆ وەرگرتنی رەزامەندی چاپکردن، دوای ساڵانێکی زۆرچاوەڕوانی، هەر چاپ نەکرا.

دیارە ئەو رێچکە نەتەوەییەی کە بەنگینە گرتوویەتییە بەر، هۆکاربووە بۆ فەرامۆشکردنی چاپی دیوانەکەی لەلایەن دەزگای رۆشنبیری ئەوسای حکومەتی عیراقەوە، بە درێژایی دوای راپەڕینیش دیوانەکەی هەر چاپ نەکرا تا لە ساڵی ٢٠٠٣دا بەهەوڵی (خەبات تۆفیق بەنگینە)ی کوڕەزای، یەکەم چاپی دیوانی بەنگینە کرا، ١٣ ساڵ دواتر و لەساڵی ٢٠١٦دا بەهەوڵ و کۆششی (رێبوار تۆفیق بەنگینە)ی کوڕەزای بەنگینە، دیوانەکە بەشێوەیەکی فروانترو دەوڵەمەندتر، چاپکرایەوە.ئەوەی لەم دیوانەی بەردەستدا بڵاوکراونەتەوە، ئەو شیعرانەن کاتی خۆی لە رۆژنامەو گۆڤارەکانی ژین و ژیان و گەلاوێژ و هەتاو بڵاوکراونەتەوە، لەگەڵ هەندێک پارچە شیعری دیکە کە لای بنەماڵەکەی دەستکەوتوون.

سەرچاوەکان:

١- دیوانی بەنگینە. کۆکردنەوەو ئامادەکردنی: عوسمان محەمەد هەورامی. چاپی دووەم- ٢٠١٦.
٢- چراکانی نیشتمان. نووسینی: خەلیل عەبدوڵڵا- چاپی دووەم ٢٠٢١.
٣- گوڵچنی گیو- کۆکردنەوەی گیو موکریانی. بژارکردن. ڕێکخستن. ساخکردنەوەو زێدەکردنی کوردستانی موکریانی- بەرگی یەکەم ٢٠١٩.
٤- دەنگی کورد. یەکەمین ڕۆژنامەی سیاسیی کوردیی سەربەخۆیە. گردوکۆ. ساغکردنەوەو ئامادەکردن عەبدوڵلا زەنگەنە- ٢٠٢٢.
٥- پەیوەندی تەلەفۆنی لەگەڵ ڕێبوار تۆفیق بەنگینە. کوڕەزای شاعیر.

# نامرن ئەوانەی وا لە دڵی میللەتدا دەژین

## گۆشەی

ئامادەکردنی: بەشی شه

نامرن ئەوانەی والەدڵی میللەتدا دەژین

یەکێتی نیشتیمانی کوردستان ئەو حیزبەی لەسەرەتای دامەزراندنییەوە تائێستا زیاتر لە(18) هەزار شەهیدی پێشکەش بە گەلی کورد کردووە هەر ئەوەشە کە یەکێتی نازناوی حیزبی شەهیدانی پێ بەخشراوە،بستە خاکێکی نیشتیمان نابینی بەخوێنی ڕۆڵەیەکی یەکێتی سوور نەبووبێت،مێژووی ئەم حیزبە تێکۆشەرە هەر لەسەرەتای دروست بوونییەوە تائێستا بەچەند قۆناغێکی سەخت و دژواردا تێپەڕیووە و مێژووەکەشی لێوان لێوە لە سەروەریی گەورە و گران بەها(ی.ن.ک) بەدرێژایی خەباتی چەکداری شاخ و شار دەیان داستان و قارەمانێتی بۆ میللەتەکەی تۆمار کردووە لەپێناو بەدەست هێنانی ئازادی و پاراستنی مافی مرۆڤ و بەدیهێنانی مافی چارەی خۆنوسین و ئەزموونی حوکمڕانی کوردستان نزیك لەیەك چارەکە سەدە خەبات و بەردەوامی شاهیدی ئەو ڕاستیەن و لەوپێناوەشدا دەیان سەرکردە و سەدان فەرماندە و هەزاران پێشمەرگەی بەئەمەك لەدژی شەڕەنگێزی داگیرکەران و هێرش و پەلاماری تیرۆرستان لەسەنگەری بەرگریدا شەهید بوون و بەخوێنی گەشیان ئەم ئازادیەی ئەمڕۆیان دروست کرد. (گۆشەی نەمران لەگۆڤاری "ڕێبەر") تایبەتە بە شەهیدان هەوڵ دەدەین لەگەڵ دەرچوونی هەر ژمارەیەك ژیان نامەی چەند شەهیدێك بخەینە بەر دیدەی هاوڕێ و هاوسەنگەر و خوێنەرانی بەڕێز.

لەگەڵ ڕێزدا.

# نەمران

ی ڕێکخستنی پێشمەرگە



رائد / حسێن ئیسماعیل محەمەد خەمیس
لەساڵی 1976 لە خانەقین لەدایک بووە .
لە ساڵی 1991 بووە بە پێشمەرگە و کۆتا ئەرکی پێشمەرگایەتی ( ف. سریە ) بووە لە یەکەی 136ی گەرمیان.
لەبەرواری 27/8/2014 لەجەلەولا شەهید بووە.



نەقیب ئومێد قادر ئینجە محەمەد
لە ساڵی 1978 لە چەمچەماڵ لەدایکبووە
لە ساڵی 1992 بووە بە پێشمەرگە و کۆتا ئەرکی پێشمەرگایەتی پایە: جێگری فەوج بووە لە یەکەی 136ی گەرمیان .
بەرواری 10/8/2014 لە جەلەولا شەهید بووە



ملازم اول / چۆمان ڕەحمان مەحمود سلێمان
لەساڵی 1990 لە کەلار لەدایک بووە.
لە ساڵی 2007 بووە بە پێشمەرگە لە یەکەی/ 136ی گەرمیان پایە: (ف. سریە )بووە
لە بەرواری: 27/10/2014 لە جەلەولا شەهید بووە



مارف عوسمان ئەحمەد
لە ساڵی 1992 لە خورماتوو لەدایکبوون.
لەساڵی 2013 بووە بە پێشمەرگە لە یەکەی 136ی گەرمیان.
لە بەرواری 23/11/2014 لە جەلەولا شەهید بووە



# پیرەمێرد

جاران ئەم کوردە هێندە بەوەفا بوو
دزیشیان قەدری وەفای لابوو
ئێستا کە پارووت کرد بە دەمییەوە
پەنجەشت ئەخوا هەر بەدەمییەوە
تۆ تێری ئەکەی لەنان و کەرە
ئەو کە تێری خوار پێت ئەڵێ کەرە



# ئەمنە سوورەکە

## دوایین مۆڵگەی ڕژێمی بەعس کاتی ڕزگارکردنی شاری هەڵەمەت و قوربانی